


تۆ گەورەتر لەوەیت کە بیری لێ دەکەیتەوە ٦

# ڕەوشت بەرزی

## مەسعود لەعلی



چاپی سێیەم

وەرگێڕانی: سەردار حەسەن خاڵی

# پێڕست

## پێشەکی
## (چیرۆک و پەندەکان)

لەکۆنـدا، پیرەمێردێـك لەگـەڵ تاکـە کوڕەکـەی دەژیـا. ڕۆژێـك کـوڕە بـەهۆی کـارە نەشـیاوەکانی بـاوکی لـەخۆی تـووڕە کـرد و بـاوکی بـە هاوارەوە وتی: "کوڕم تۆ نابیت بە مرۆڤ!"

کوڕە تۆرا، لەماڵ چووە دەر و باوکی تەنها جێهێشت!

ساڵانێك تێپەڕی...

کوڕە کە ئیتر پیاوێکی پێگەیشتوو بوو و کرابوو بە حاکمی شارێك، ڕۆژێك ژمارەیەك لەسەربازەکانی ڕاسپارد بۆ ئەوەی باوکی بدۆزنەوە. باوکیان بۆ هێنا و لەگەڵ چاوپێکەوتنی، کوڕە بە گاڵتەجارییەوە وتی: "پیرەپیاو لەبیرتە کە بە منت وت نابیت بە مرۆڤ! ئێستا سەیر بکە!"

باوکە پیرەکەی کە بەهۆی تەمەنەوە بەسەختی دەیتوانی ببینێت، هەندێك لەڕوخساری حاکم ورد بووەوە و کوڕەکەی ناسییەوە. دەست بەجێ وتی:

"ئەری کوڕم.. لەبیرمە، بەڵام خۆ من نەموت نابیت بە حاکم، وتم نابیت بە مرۆڤ!"

لەپەندێکی فارسیدا هاتووە کە بوون بەمەلا و زانا چەندە ئاسانە و مرۆڤ بوونیش چەندە گرانە.

بابەتی مرۆڤ، گەشە، پێگەیشتن و لەکۆتاییدا (مرۆڤی کامڵ) یەکێك لـەگرنگترین و دێـرینترین باسـەکانە، کـە لەکـەلتوورەکان و ئایـدیا جیاوازەکانی فکر و فەلسەفەی خۆرهەڵات و خۆرئاواشدا هەبووە. ئێمە

هێشتاش گوێمان لەدەنگی پێی دیووژەن – حەکیمی یۆنانی کۆن – ە لەدڵی مێژوودا کە بەچرایەك لەڕۆژی ڕووناکدا بەدوای مرۆڤی (کامل)دا دەگەڕا.

گەیشتن بە بەختەوەری، ئارامی و رزگاربوون لەکۆتوبەند، گرنگترین ئامانجی مرۆڤایەتییە و گومان لەوەدا نییە کە رۆیشتن بەرەو گەشەسەندن و بەلاوەنانی کەموکورییەکان و لاوازییە کەسایەتی – رەفتارییەکان، گرنگترین رۆڵ دەبینێت لەڕێی گەیشتن بەئارامی و ئاسایش.

ئێمە ئامادە نین لەسەر خودی خۆمان سەرمایەگوزاری بکەین، بەوە نازانین کە هەر گۆڕانکارییەك لەژیانماندا بە گۆڕان لەدەروونی خۆمانەوە دەست پێدەکات. هەوڵ دەدەین بە چوونە ناو رەوتی "بەدەست هێنان" بۆشاییەکانی ژیانمان پڕ بکەینەوە. کەچی بێ ئاگاین لەوەی کە خۆشبەختیمان راستەوخۆ پەیوەندی بەوەوە هەیە کە هەین، نەوەك ئەوەی کە هەمانە.

لەڕاستیدا دۆزینەوەی مرۆڤی کامل، بەشێکی زۆری رێگەچارە، ئاواکردنی دنیایەکی باشتر و راکردن لەدۆزەخی نائومێدی و سۆزە نەرێنییەکانی تاکە کەسی پێك دەهێنێت.

دوو سەفەر و دوو هەڵبژاردنمان لەپێشە. یەکیان، سەفەرێکی دەرەکی و ئەوی تر سەفەری دەروونی. بەڵام دووهەم بژار، لەئاکامدا رووبەڕووی (وجود)ی سەرتری خۆمانمان دەکاتەوە. گەورەییەك کە لەقووڵایی (وجود)ی ئێمەدا هەروەك خەزێنەیەك چاوەڕێی دۆزینەوەیە.

١

# لەئاینی جوامێراندا

پرسیان: "جوامێر بەچیدا دەزانێت کە جوامێرە."
وتی: "بەوەی کە ئەگەر خوداوەند هەزار چاکە
لەگەڵ براکەیدا بکات و لەگەڵ ئەودا یەك، ئەویش
دەخاتە سەر (دە)کەی تر تاکو بۆ براکەی بێت."

/ خەڵکی سێ گروپن: یەکێک بێ
ئەوەی ئازارت بۆی هەبێت، ئازارت
دەدات، یەکێک ئازاری بدەیت، ئازارت
دەداتەوە و یەکی تریش کە ئازاری
بدەیت، ئازارت ناداتەوە. /

*"ئەبولحەسەن خەرقانی"*

## ئایینی جوامێری

گەنجێکی برسی و تینوو لەبیاباندا مابوویەوە، کە لەپڕ چاوی دەکەوێت بە پیرەمێردێک، ئاخۆ خەون بوو؟

لێی نزیک بوویەوە، ئا، ڕاست بوو. پیرەمێرد نان و ئاوی پێی دا و، دواتر لەتەنیشت ئاگرێک کە پیرەمێرد کردبوویەوە، تاکو بەیانی خەوت.

بەیانی کاتێک پیرەمێرد لەخەو هەستا، گەنجەکە و ئەسپەکەی نەمابوون. سەیری دەوروبەری کرد. گەنجەکەی بینی کە سواری ئەسپەکەی ئەو بووە و خەریکە دوور دەکەوێتەوە. بانگی لێکرد و وتی: "تکایەکم لێت هەیە."

گەنجەکە وتی: "بیڵێ"

"تکایە لەبارەی ئەم بەسەرهاتەوە بۆ کەس مەدوێ"

گەنجەکە وتی: "تۆ نان و ئاوت دا بەمن، لەپاڵ ئەو ئاگرەی تۆ کردبووتەوە شەوم بەسەر برد، بەڵام خواستی تۆ تەنها ئەمەیە کە لەبارەی ئەم بابەتەوە لەگەڵ کەس قسە نەکەم."

پیرەمێرد بەڕوویەکی ترشەوە وەڵامی دایەوە: "با ئەگەر هات و کەسێك ڕۆژێك، کەسێکی تری لەبیابان بینی کە پێویستی بە یارمەتییە، لەیارمەتیدانی دوودڵ نەبێت و ئاییتی جوامێری لەناو نەچێت."



/ بە دەروێشێکیان وت: بۆچی ژن ناهێنیت؟
وتی: ژن، پیاوی شایستەی دەوێت و من
هێشتا بەپلەی پیاوێتی نەگەیشتووم،
چۆن ژن بهێنم! /

## رازی نابینایی

پیاوێک ژنی هێنا، پێش ئەوەی ژنەکە بچێت بۆ ماڵی مێردەکەی تووشی نەخۆشی بوو و چاوێکی لەدەست دا.

کاتێک پیاوەکە ئەو هەواڵەی بیست، وتی: "تووشی چاوئێشە بووم"، پاش ماوەیەک وتی: "چاوەکانم نابینا بوون!"

ژنەکەیان هێنا بۆ ماڵی و بیست ساڵ لەگەڵ ئەو ژنەدا ژیا، ژنە مرد. پیاوەکە هەردوو چاوی کردەوە.

وتیان: "چۆن شتی وا دەبێت؟"

وتی: "خۆم لەکوێری دا تاکو ئەو ژنە خەفەت لەحاڵی خۆی نەخوات."

وتیان: "تۆ پێش هەموو جوامێرێک کەوتیت."

## ئەمانەت و ئەمینداریی

پیاوێك تاریك و ڕوونی بەیانی لەماڵ دەرکەوت تاکو بچێت بۆ گەرماو. لەرێدا، چاوی بە هاوڕێیەك کەوت، وتی: "گەر پێت باش بێت بەیەکەوە بچین بۆ گەرماو؟" وتی: "تاکو بەر دەرگای گەرماوەکە لەگەڵتدا دێم."

بەڵام لەسەر دووڕیانێك بێ ئەوەی ئەو پیاوە ئاگادار بکاتەوە بەڕێیەکی تردا ڕۆیشت. بە هەڵکەوت دزێك لەدواوەی ئەو پیاوە دەڕۆیشت. پیاوەکە ئاوڕێکی لەدواوە دایەوە و دزەکە بینی. هێشتا تاریك بوو، وایزانی هاوڕێکەیەتی، سەد دینار لەگیرفانیدا بوو. دەریهێنا و خستیە ناو دەستی دزەکە و وتی: "براکەم، ئەمە ئەمانەتی تۆ بێت، کاتێك لەگەرماو هاتمە دەرەوە پێمی بدەرەوە."

دزەکە لێی وەرگرت و لەوێدا مایەوە تاکو لەگەرماوەکە هاتە دەرەوە. ڕۆژ ڕووناك ببوو، جلەکانی لەبەر کردەوە و ڕێی ماڵەوەی گرتەبەر.

دزەکە بانگی لێکرد و وتی: "ئەی جوامێر پارەکەت وەربگرەوە و برۆ. ئەمڕۆکە لەئێش و کارت خستم."

پیاوەکە وتی: "ئەم پارەیە چییە و تۆ کێیت؟" وتی: "من کابرایەکی دزم، وتی: "ئەگەر تۆ دزیت بۆچی پارەکەی منت نەبردووە؟"

دزەکە وتی: "تۆ بە ئەمانەت بە منت دا. خۆ ئەمیندار نابێت ئەمانەت بخوات، خیانەت لەئەمانەت جوامێری نییە."

"امیر عنصر المعالی"

## "دوا ئێوارەخوان"

لاوێکی گوندی لەدرێژەی یەکێك لەگەشتەکانی خۆی لەماڵی هاوڕێکەی دەمێنێتەوە و شەو لەوێ دەخەوێت. خانەخوێ بۆ میواندارێتی لە هاوڕێکەی چێشتێك بەگۆشتی مەلی کێوی لێدەنێت.

لەکاتی خواردن لاوە گوندییەکە پرسیار دەکات: "ئایا ئەم چێشتە بە گۆشتی مەلی کێوی لێنراوە؟" خانەخوێ لەوەڵامدا دەڵێت: "نا."

لاوە گوندییەکە پاش خواردنماڵئاوایی دەکات و درێژە بە گەشتەکەی دەدات. پاش تێپەڕبوونی چەندین ساڵ دووبارە رێی دەکەوێتەوە ماڵی هاوڕێکەی. خانەخوێ پرسیاری لێ دەکات: "ئایا هەز بە خۆراکی مەلی کێوی دەکات؟" لاوی گوندی دەڵێت: "ئەم چێشتە لەلایەن سیحربازی هۆزەکەیانەوە بۆ ئەو قەدەغە کراوە."

خانەخوێ دەڵێت: "ئەو چێشتەی چەند ساڵ لەمەوبەر لێرە خواردت مەلی کێوی بوو." لاوە گوندییەکە ترس و لەرز دایدەگرێت و لەئاکامدا پاش بیست و چوار کاتژمێر دەمرێت.

## "بۆ هەر جێیەك بڕۆیت، ئاسمان هەر ئەم ڕەنگەیە"

دەووترێت کە زۆربەی کات سوقرات لەپێش دەرگای شاری ئەسینا دادەنیشت و بێگانەکانی بەخێرهاتن دەکرد. ڕۆژێك بێگانەیەك چووە لای و وتی: "من دەمەوێت لەشارەکەی ئێوەدا نیشتەجێ بم. خەڵکی ئەم شارە چۆن خەڵکێکن؟"

سوقرات پرسی: "لە زێدی خۆت مرۆڤەکان چۆنن؟"

پیاوی بێگانە وتی: "خەڵکێکی ئەوەندە باش نین. درۆ دەکەن، فێڵبازن و دزی دەکەن. لەبەر ئەوەیە کە زێدی خۆم تەرك کردووە."

سوقراتی ژیر دەڵێت: "خەڵکی ئێرەش هەر بەهەمان شێوەن. ئەگەر لەجیاتی تۆ بوومایە لەگەڕان بەردەوام دەبووم."

پاش کەمێکی تر، بێگانەیەکی تر هات بۆلای سوقرات و لەبارەی خەڵکی ئەسیناوە پرسیاری لێکرد. سوقراتیش دووبارە دەپرسی: "مرۆڤەکانی شاری خۆت چۆن مرۆڤێکن؟"

بێگانە جوابی دایەوە: "بێ کەموکوڕین، یارمەتی یەکتر دەدەن و ڕاستگۆ و زەحمەتکێشن. لەبەر ئەوەی دەمویست شوێنەکانی تری دنیاش ببینم وڵاتەکەم جێ هێشت."

سوقراتی بیرمەند لەوەڵامی ئەمەیاندا دەڵێت: "ئێرەش هەر بەم شێوەیە. بۆچی ناچیتە ناو شارەکەوە؟ دڵنیابە ئەم شارە، هەمان شوێنە کە وێنات دەکرد."

/ تێبینی: خۆمان چۆن بین دنیاش هەر بەو شێوەیە دەبینین و لە دەروونی خۆماندا چی هەبێت لەکەسانی تریشدا هەر ئەوە دەبینین. مرۆڤێک کە باش و بەسۆز بێت، لەدەوروبەری و لەو مرۆڤانەی کە لەگەڵیاندا پەیوەندی هەیە جگە لە چاکە شتێکی تر نابینێت و، مرۆڤی لاسار و ڕەشبینیش بچێت بۆ هەر شوێنێک جگە لە ناشیرینی و کەموکوڕی ژینگەکەی شتێکی تر نابینێت. لەبەر ئەوەیە کە دەڵێن: "بەرلەوەی ناونیشانت بگۆڕیت فکرت بگۆڕە." کاتێک دەگۆڕێن بچین بۆ هەر شوێنێک ئاسمان هەر ئەم ڕەنگەیە. /

## فیداکاری

/ حسێن ئەنتاکی کە شێخێکی ناسراو بووە، دەگێڕێتەوە: "زیاتر لەسی هاوڕێم کۆببوونەوە، تەنها نانێکیان پێ بوو." نانەکەیان لەت لەت کرد و چراکەیان کوژاندەوە تاکو ئەوەی خواردی شەرم نەکات، کە زیاتر یان کەمتری خواردبێت.

کاتێک چراکەیان داگیرساندەوە نانەکە هەروا لەشوێنی خۆی مابووەوە. کەس دەستی بۆ نەبردبوو و فیداکارییان بۆ یەکتر دەنواند. /

"محەمەد عوفی"

## حورمەتی نمەك

دەگێڕنەوە کە یەکێك لەدزەکانی ماوراءالنهر (سنووری ئێران و سۆڤێتی کۆن) کە لەکاری دزیدا زۆر لێهاتوو بوو، ڕێی کەوتە شاری نەیشابووری ئێران و بڕیاری دا کە لەو شارەدا ماڵ و موڵکێك بەدەست بهێنێت. پاش لێکۆڵینەوە، شوێنی خەزێنەی میری نەیشابووری دۆزییەوە، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر توانی تونێلێك هەڵبکەنێت کە دەچووە سەر خەزێنەی ئەمیر.

شەو لەو تونێلەوە چووە ناو خەزێنەکە و لەتاریکی شەودا شتێکی بینی کە دەتروسکێتەوە و ڕووناکە، بیری لەوە کردەوە کە لەوانەیە (گەوهەری شەوچرا) بێت، کە زۆر بەنرخ بوو. چەندەی دەستی لێدا و هێنای و بردی، هیچی لێ تێنەگەیشت. سەری سوڕمابوو کە بەڕاستی ئەوە چییە؟ زمانی بەو شتەدا هێنا و تامی کرد، زانی کە خوێیە.

گەڕابوو هەرچی هەڵیگرتبوو داینایەوە سەر جێی خۆی و بەبێ ئەوەی شتێك لەگەڵ خۆیدا ببات، ڕۆیشت.

ڕۆژی دواتر ئەمیریان ئاگادار کردەوە کە کۆمەڵە دزێك تونێلیان هەڵکەندووە و چوونەتە سەر زێڕوزیوەکەی، بەڵام هیچیان نەدزیوە و ڕۆیشتوون. ئەمیر واق مابوو، کە چۆن تونێلیان هەڵکەندووە و چوونەتە سەر زێڕوزیوەکەی و هیچیشیان نەبردووە.

ئەمیر فەرمانی دا بانگەوازێك بكەن كە چۆن دز خوێی گەیاندووەتە خەزێنە و هیچی لەگەڵ خۆیدا نەبردووە و، هەر كەسێك راستگۆیانە دانی پێدابنێت، ئەمیر ببیبەخشێت.

رۆژێك دوای بانگەوازەكە گەنجێك هات بۆلای ئەمیر، كاتێك پرسیاریان لێكرد، لەوەڵامدا وتی: "وامزانی كە ئەو شتە گەوهەری شەوچرایە. بەڵام كاتێك زمانم پێیدا هێنا و تامم كرد، بۆم دەركەوت كە خوێ بووە. لەبەر ئەوەی ئەمكم تام كردبوو رۆیشتم لەبەرئەوەی لەمەزهەبی جوامێریدا واجب بوو.

هەربۆیەش دەستم بۆ كەم و زۆر نەبرد و لێی خۆش بووم. ئەمیر لەگەڵ بیستنی قسەكانی، دەستخۆشی لێكرد و كردی بە فەرماندەی سوپاكەی و، ئەو پیاوەش وازی لەدزی هێنا و بووبە یەكێك لەپیاوە گەورەكانی ئەیشابوور.



چاندیان و خواردمان و دەچێنین و دەیخۆن
لەڕاستیدا هەمووومان جووتیاری یەکترین
*"سەعد وەراوینی"*

## پاشا و پیرەمێرد

ڕۆژێك ئەنوشیروان کە پاشایەکی دادوەر بوو، بەڕێگەیەکدا دەڕۆیشت کە تووشی پیرەمێردێکی داچەماو بوو. پیرەمێرد خەریکی ناشتنی دارگوێزێك بوو. ئەنوشیروان پێی وت: "تۆ کە قژت وەکو شیر سپی بووە و چەند ڕۆژێکت لەژیاندا ماوە، بۆچی درەخت دەچێنیت کە دە ساڵی تر بەروبوومەکەی پێدەگات؟!"

پیرەمێرد لەوەڵامدا وتی: "تاکە هۆکارێك بەسە بۆ درەخت چاندن و ئەویش، ئەوەیە کە تاکو زیندوویت دەبێ کارێك ئەنجام بدەیت و بێکار نەبیت، هەروەکو ئەوانی تریش بێکار دانەنیشتن، درەختیان بۆ ئێمە چاند و خۆیان ماڵئاواییان لەژیان کرد. تاکو زیندوو بین دەبێ سوودمان بۆ کەسانی تر هەبێت."

## ئەوانی تر چاندیان، ئێمە دەیخۆین، ئێمە دەچێنین ئەوانی تر دەیخۆن

پاشا ئەم قسەیەی بەلاوە خۆش بوو و کیسەیەک زێڕی دا بەو پیرەمێردە.

پیرەمێرد وتی: "ئەی پاشای بەخشندە، درەختەکەی من هەر ئەمڕۆ میوەی خۆی دا. ئێستا کە تەمەنی من حەفتا سالیشی تێپەڕاندووە، سوودی خۆم لەم درەختە وەرگرت و دە سالْ چاوەڕوان نەبووم."

پاشا ئەم وەلامەی پیرەمێردیشی بەدڵ بوو و مووچە و مەزرای پێ بەخشی، ئەوەندەی کە پیرەمێرد لەماڵی دنیا بێ منەت بوو.

*"عەتاری نەیشابووری، ئیلاهی نامە"*

زانایەک وتی: هاوڕێی راستگۆ لەگەڵ تۆدا پەیوەندی رۆحانی هەیە و خزم، پەیوەندی جەستەیی هەیە.

## هاوڕێی وەفادار

"ئەبوحامدی دۆستان" لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بەڕێدا دەڕۆیشت. هاوڕێکەی وتی:

"ئاسیاوێکم لێرە هەیە، تۆ لێرە بمێنەوە تاکو کارەکەم تەواو دەبێت."

ئەو رۆیشت و ئەبوحامد دانیشت. هاوڕێکەی ئەو شەوە نەهاتەوە و بەفرێکی قورس باری. رۆژی دواتر ئەو پیاوە هاتەوە. ئەبوحامد لەناو بەفردا دەجووڵا و بەفری لەسەر دەڕژا.

ئەو پیاوە وتی: ئەبوحامد تۆ هێشتا لێرەیت؟

ئەبو حامد پێی وت: "ئەرێ، ئەی تۆ نەتووت لێرە بە؟ ئەمە وەفای منە بۆ هاوڕێکەم!"

"جامی، نفحات الانس"

## باشترین و خراپترین کەسی بەنی ئیسرائیل

شێخ (ابوسعید ابوالخیر) وتی: وەحی هات بۆ موسا... کە بە بەنی ئیسرائیل بڵێ باشترین کەس هەڵبژێرن. سەد کەسیان دەستنیشان کرد. وەحی هات کە لەم سەد کەسە باشترینیان هەڵبژێرن. دە کەسیان هەڵبژارد. وەحی هات کە لەم دە کەسە، سێ کەسیان هەڵبژێرن. سێ کەسیان هەڵبژارد. وەحی هات کە لەم سێ کەسە باشترینیان هەڵبژێرن. یەکیان هەڵبژارد. وەحی هات کە بەم تاکە کەسە بڵێن تاکو خراپترین کەسی بەنی ئیسرائیل بهێنێت. ئەو چوار ڕۆژ مۆڵەتی خواست و بە دەوری دنیادا دەگەڕا بۆ ئەوەی کەسێك هەڵبژێرێت.

ڕۆژی چوارەم لەکۆڵانێکەوە دەڕۆیشت، پیاوێکی بینی کە بە گەندەڵی و داوێنپیسی دەناسرا و، هەموو چەشنە کردەوەیەکی نەشیاوی ئەنجام دەدا، بەشێوەیەك کە خەڵکی بە پەنجە ئاماژەیان پێ دەکرد، ویستی ئەو لەگەڵ خۆیدا بەرێت، بیرێك بەمێشکیدا هات کە نابێت لەسەر ڕواڵەتی مرۆڤ حوکم بکرێت، با ئەویش وەکو مرۆڤ پلە و پێگەیەکی هەبێت. ناتوانم بەوتەی خەڵك ئەو بە سووك و کەموکورت

لەقەڵەم بدەم و ئێستا کە خەڵکی منیان هەڵبژاردووە ناتوانم لەخۆبایی بم. چونکە هەرچی بیکەم، لەڕووی گومانەوە دەبێت، باشتر وایە ئەو گومانە لەخۆم بکەم. گەڕایەوە لای موسا و وتی: "هەرچی سەیرم کرد لەخۆم خراپتر کەسم نەبینی. وەحی هات بۆ موسا کە ئەو پیاوە باشترینیانە، نەک لەبەر ئەوەی کە خواپەرستە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆی بە خراپترین کەس دانا.

*"محمد بن منصور، اسرارالتوحید"*



## حەزرەتی ئادەم لەبەرامبەر شەش پەیکەردا

حەزرەتی ئادەم(د) ڕۆژێکیان بینی لەناکاو، سێ پەیکەری ڕەش و ناشیرین لەلای چەپییەوە دەرکەوتن و سێ پەیکەری نورانیش لەلای ڕاستیەوە. پرسیاری لەپەیکەرەکانی لای ڕاستی کرد، ئێوە کێن؟

یەکەمیان وتی: من "عەقڵ"م. دووەمیان وتی: من "شەرم"م. سێهەمیان وتی: من "بەزەیی"م.

ئادەم(د) پرسی: "شوێنی ئێوە لەکوێیە؟"

یەکەمیان وتی: "لە سەری مرۆڤەکاندا"، دووەمیان وتی: "لەچاوی مرۆڤەکاندا" و، سێهەمیان وتی: "لەناو دڵی مرۆڤەکاندا".

ئادەم(د) گەڕایەوە لای چەپی و پرسیاری لەپەیکەرە ڕەش و ناشیرینەکان کرد: ئێوە کێن؟

یەکەمیان وتی: من "تەکەبور"م. حەزرەتی ئادەم وتی: "شوێنی تۆ لەکوێیە" وتی: "لە سەری مرۆڤەکاندا"

ئادەم فەرمووی: "ئەی سەر شوێنی عەقڵ نییە!"

تەکەبور وتی: "ئەگەر من بچمە ناو سەرەوە، عەقڵ دەچێتە دەرەوە."

لەدووەمیانی پرسی: "تۆ کێیت؟" وتی: من "تەماح"م.

فەرمووی: "شوێنی تۆ لەکوێیە؟" وتی: "لەناو چاوی مرۆڤەکاندا"

فەرمووی: "ئەی چاو شوێنی شەرم نییە!"

تەماح وتی: "ئەگەر من کەوتمە ناو چاو، شەرم دەڕوات."

لەسێهەمیانی پرسی: "تۆ کێیت؟"

وتی: من "ئیرەیی"م.

فەرمووی: "شوێنی تۆ لەکوێیە؟"

وتی: "شوێنی من لەناو دڵی مرۆڤەکاندایە."

فەرمووی: "ئەی دڵ شوێنی بەزەیی نییە!"

ئیرەیی وتی: "ئەگەر من بچمە ناو دڵی مرۆڤەوە، ڕەحم و بەزەیی لەناو دڵیدا نامێنێت".



ئەوەی چاکەکانی خۆی ببینێت، تووشی
دیتنی خراپەکانی خەڵك دەبێت و ئەوەی
کەموکوڕی خۆی ببینێت چیتر دوای کەم
وکوڕی خەڵك ناکەوێت.
"محفوظ بن محمود"

## ڕاکردن لەخود

لەبارەی ڕاکردنی مرۆڤ کاتی بینینی سیفەتی خراپی خۆی، پرسیاریان لەمەولەوی کرد. مەولەوی وتی: فیلێکیان هێنایە سەر کانییەك بۆ ئەوەی ئاو بخواتەوە. خۆی لەئاوەکەدا دەبینی و رایدەکرد. فیلەکە وایدەزانی کە لەیەکی تر رادەکات، نەیدەزانی کە لەدەست خۆی رادەکات.

هەموو رەوشتێکی خراپ، لەستەم و رق و ەوە بگرە تاکو ئیرەیی و تەماح و بێ بەزەیی و خۆپەرستی، کە لەناخی خۆتدا هەیە بێزارت ناکات، بەڵام کاتێك لەکەسێکی تردا دەیانبینی، رادەکەیت و بێزار دەبیت.

"مولوی، فيه ما فيه"

# نەفسی خۆت بکوژە

ماوەیەك نەمتوانی بەشداری بکەم لەکۆڕی شێخ ئەبوسەعید و، زۆر بەداخەوە بووم لەوەی کە بێ بەش بووم لەسوودەکانی دانیشتن لەگەڵ شێخ دا.

کاتێك لەمەیمەنە (شارێکی دێرینە لەئێران) گەیشتمە خزمەتی شێخ، وتی:

"ئەی عەبدولسەمەد!" داخی ئەوەت لەدڵدا نەبێت، ئەگەر دە ساڵیش لای ئێمە ئامادە نەبیت، چونکە جگە لەم قسەیە هیچی تر ناڵێینەوە و ئەویش ئەمەیە:

/"نەفسی خۆت بکوژە و هیچی تر./

"شێخ عەبدولسەمەد سۆفی سەرەخسی"

سەبرکردن تاڵە، بەڵام میوەیەکی شیرین و پڕسوودی هەیە.
*"مەولەوی"*

## رازی بارسووکی

دوو هاوڕێ بەیەکەوە لەگوندێکەوە بەرەو شار دەڕۆیشتن و هەریەکە و سەبەتەیەك پڕلەمیوەی بەسەر شانەوە بوو. یەکیان بەسەبر بوو و ئەوی تر بێ سەبر و بێزار، ئەمەیان بەردەوام گلەیی لەقورسی بارەکەی دەکرد و دەیناڵاند. ئەویان دەم بەپێکەنین و خەرامان دەڕۆیشت و خەریکی گاڵتە و گەپ بوو.

هاوڕێی بێ سەبر و بێزار وتی: "براکەم، وێڕای ئەوەی کە دەزانم بارەکەی تۆ لەباری من سووکتر نییە و لەمنیش بەهێزتر نیت، هۆی خەندە و خۆشحاڵی تۆ چییە؟

وتی: "برای من، گیایەکم لەسەر سەبەتەکەم داناوە کە بار سووك دەکات و لەهەڵگرتنی بارەکەدا هێزم پێ دەبەخشێت."

کاتێك هاوڕێکەی ئەم قسەیەی بیست، زۆر سەرسام بوو و وتی: "چی دەبێت گەر منەت بکەیت و هەندێك لەو گیایە بەمنیش بدەیت."

وتی: "کاکی برا، ئەم گیایە کە بار سووك دەکات و هێز و وزە دەدات بە بارهەڵگر، ناوی "سەبر"ە."

## سەبر چییە؟

ئەبو حەسەن نوری، پیرێکی بینی لاواز و بێ هێز، کە و ئەویش بە سەبر بوو. دواتر بردیان بۆ زیندان.

چوو بۆلای و پرسی:

ئەی پیرەمێرد! تۆ کە وەها کز و لاوازی چۆن سەبرت گرت بەرامبەر بەو ؟

پیرەمێرد کەمێك تێڕاما و وتی: "ڕۆڵە! بەڵا کە هات بەهیمەت بەرامبەری دەوەستمەوە نەك بە جەستە."

ئەبو حەسەن لێی پرسی:

"سەبر بەلای تۆوە چییە؟"

پیرەمێرد لەوەڵامدا وتی:

"ئەوەی کە لەکاتی هاتنی بەڵادا، وا دەکات وەك ئەوە بیت کە بەڵات لێ دوور بووبێتەوە!"

"تذكرة الاولیا"

## بوێری

دەگێڕنەوە، مشکێکی ترسنۆک، داوای لەسیحربازێک کرد هێندەی پشیلە گەورەی بکات، تاکو مەترسی پشیلەی لەسەر لاچێت، بەڵام نەک تەنها لەبەرگی پشیلەدا، بەڵکو لەهەیبەتی سەگ و پڵنگ و شێر-یشدا ترسی پشیلەی لەسەر لانەدەچوو. سیحرباز پێی وت:

"جا سوودی چییە؟ هەتا دڵی مشکێک لەسنگتدا بێت، بەرگی گورگ و گا و شێر و پڵنگ-یش بەکەڵکی تۆ نایەت.

ئەگەر پڵنگی بیابان بیت یان نەهەنگی دەریا، گەر لەبەرگی شێر یان گورگدا بیت، کاتێک دڵێکی پڕلەترس لەسنگتدا لێدەدات، سوودی چییە؟ کە هەر کات و ساتێک، نەک جارێک بەڵکو سەدان جار مەرگ بەچاوی خۆت دەبینیت."

خووی باش ئەوەیە کە کەس ئەرمەنجێنێت و ڕەنج بچێژێت بەبێ ڕك و كین.
"تذکرة الاولیاء"

## خووی باش

پیاوێکی زل و کەتەی باڵابەرز کە دەموچاوێکی خاراوی هەبوو و لێدان و کوتانەکانی گۆڕەپانی شەڕ، گۆشەی چاوی هەڵدڕیبوو و لەسەر ڕوخساری یادگاری جێهێشتبوو، قورس و قایم هەنگاوی دەنا و بەناو بازاڕی کوفەدا تێدەپەڕی.

لەلایەکی ترەوە پیاوێکی کاسب کە لەدوکانەکەی خۆی دانیشتبوو، بۆ ئەوەی هاوڕێکانی بهێنێتە پێکەنین، مشتێك زبڵی هەڵدایە بەردەم ئەو پیاوە. کابرای ڕێبوار بەبێ ئەوەی گرژی بکەوێتە ناوچاوانییەوە و وەڵامێك بداتەوە، بەهەمان شێوە قورس و قایم هەنگاوی دەنا و لەسەر ڕێی خۆی بەردەوام بوو.

لەگەڵ دوورکەوتنەوەی یەکێك لەهاوڕێکانی کابرانی دوکاندار پێی وت: "ئەو ڕێبوارەت دەناسی کە وا سووکایەتیت پێ کرد؟!"

"نا نەمناسی! ڕێبوارێك بوو وەك هەزاران ڕێبواری تر کە ڕۆژانە لەبەر چاوی ئێمەوە تێدەپەڕن، بۆچی ئەو پیاوە کێ بوو؟"

– سەیرە! نەتناسی؟! ئەو ڕێبوارە هەمان فەرماندە و سوپاسالاری بەناوبانگ، "مالکی ئەشتەر" بوو.

- "سەیرە! ئەو پیاوە مالکی ئەشتەر بوو؟! ئەو مالکەی کە دڵی شێر لەترسانی دەبێت بەئاو و ناوی لەشی هەموو دوژمنێک دەخاتە لەرزین؟"
- "بەڵێ، مالك، خۆی بوو."
- "ئای بەحاڵی من! ئەمە چ کارێك بوو من کردم؟ ئێستا فەرمان دەدات بەسەختی سزام بدەن. هەر ئێستا دەچم لێی دەپاڕێمەوە بەڵکو لێم خۆش بێت."

بەرەو لای مالکی ئەشتەر کەوتە ڕێ. بینی ئەو بەرەولای مزگەوت لایدا. بەدوایدا ڕۆیشت بۆ مزگەوت، بینی کە دەستی بە نوێژ کرد، چاوەڕێی کرد تا سلاوی نوێژەکەی دایەوە. ڕۆیشت و بەزەلیلی خۆی ناساند و وتی: "من هەر ئەو کەسەم کە نەزانیم کرد و بێ ڕێزیم بەرامبەر بە تۆ نواند."

/ مالك وتی: "بەڵام سوێند بەخودا، من لەبەر تۆ هاتم بۆ مزگەوت، چونکە تێگەیشتم تۆ زۆر نەزان و سەرلێ شێواویت، بەبێ هۆ ئازاری خەڵك دەدەیت، دڵم بۆت سووتا، هاتم دوعات بۆ بکەم و داوا لەخوداوەند بکەم ڕێی ڕاستت پیشان بدات. نا، من ئەو نیازەم نەبوو کە تۆ بیرت لێ کردۆتەوە"/

"داستانی ڕاستان"

هونەر ئەوە نییە کە لەمیسرەوە بچیت بۆ بەغدا. هونەری جوامێران زاڵبوونە بەسەر نەفسدا.

## تووڕەیی

دەگێڕنەوە کە لای پێغەمبەری خودا(ص) وەسفی پیاوێکیان دەکرد کە گوایە پیاوێکی گەورە و بەهێزە.

وتی: "چۆن؟"

وتیان: "لەگەڵ هەرکەسێکدا زۆرانبازی بکات پشتی لەزەوی دەدات و دەرەقەتی هەموو کەس دێت."

پێغەمبەر وتی: "پیاوی گەورە و بەهێز ئەو کەسەیە کە دەرەقەتی تووڕەیی خۆی بێت نەوەک پشتی کەسێکی تر لەزەوی بدات."

*"محەمەد غەزالی، نصیحەالملوک"*

## راستگۆیی

**دەگێڕنەوە کە زانای بەناوبانگ، "بایزید بەستامی"، کاتێک دەیویست بۆ خوێندنی زانست بچێت بۆ بەغدا، دایکی رایسپارد بەوەی کە لەهەموو بوارێکی ژیاندا راستی و راستگۆیی فەرامۆش نەکات و، هەرگیز درۆ نەکات و داوای لێکرد بەڵێن بدات کە راسپاردەکەی لەیاد نەکات.**

**بایزید قبووڵی کرد، دایکیشی چل دیناری پێدا بۆ خەرجی سەفەرەکەی، کە هەموو میراتی باوکی بوو.**

**بەستامی تێکەڵ بەو کاروانە بوو کە بەرەو بەغدا دەڕۆیشت، پاش بڕینی مەودایەک گروپێک چەتە رێگەیان لێگرتن و دەورپێچ و تاڵانیان کردن. دواتر دەستیان کرد بەپشکنینی تاکەتاکەی کاروانەکە و داروندارییان لێ سەندن، کاتێک نۆرەی بایزید هات، یەکێک لەدزەکان وتی: "پێناچێت هیچی پێ بێت. جلەکانی کۆن و دڕاون و ئەگەر هەیبوایە کەمێک بەخۆی رادەگەیشت." دزەکەی تر وتی: "هۆی کوڕە، با خۆمان بەتۆوە سەرقاڵ نەکەین. ئایا هیچ پول و پارەیەکت پێیە؟"**

**بایزید وتی:**

**"بەڵێ"**

**دزەکان لەقاقای پێکەنینیان دا.**

**یەکیان پرسی:**

**"پارەکەت چەندە؟"**

بایزید وەڵامی دایەوە:

"چل دینار"

دزەکان پێیان رابوارد. یەکیان وتی: "وازی لێ بهێنن، کاتی خۆتان لەگەڵیدا بەفیڕۆ مەدەن. گەورەمان چاوەڕێمانە."

دزەکان گەڕانەوە لای سەرۆکەکەیان، ئەویش پرسیاری لێکردن: "ئایا هەموو سەروماڵی کاروانەکەتان هەڵگرت و باش پشکنیتان؟"

دزەکان چیرۆکی بایزیدیان بۆ سەرۆک گێڕایەوە. سەرۆکی دزەکان وتی:

"ئەو کورە بهێنن بۆ لام، با بزانم بۆچی وای وتووە."

دزەکان، بەستامی-یان هێنایە لای. لێی پرسی:

"ئایا هیچت پێیە کورە؟"

- "بەڵێ، چل دینارم پێیە."
- "ئەری تۆ شێت بوویت کورە؟ چۆن پارەکەی خۆت ئاشکرا دەکەیت؟ و بەدەستی خۆت دەیدەیت بە من، دەزانی کە من لێت وەریبگرم نایدەمەوە پێت؟"
- "من بەڵێنم داوە کە هەرگیز درۆ نەکەم و ئامادە نیم ئەو بەڵێنە بشکێنم."
- "لاحول ولا قوە الا باللە. سوێند بەخودا ژیانمان لەمونکەرات و ئازارداني خەڵکدا فەوتاند و تۆی گەنج، دەترسیت کە بەڵێنی خۆت بشکێنیت، ئێمەش ناترسین کە بەڵێنی خودا دەشکێنین، سوێند بەخودا چیتر دەست بۆ دزی و چەتەگەری نابەم د

لەدەرگا خوداوەند تۆبە دەکەم، بەڵکو خودا بمبەخشێت و تۆبەکەم قبووڵ بکات."

دزەکان پاش بیستنی وتەکانی سەرۆکەکەیان وتیان:

"ئێمە لەتاوانکاریدا پەیڕەوی تۆ بووین، کەوابوو لەتۆبە کردنیشدا تۆ بە تەنیا ناهێڵینەوە، ئینجا هەروەك لەچەتەگەریدا گەورەمان بوویت لەگەڕانەوە بۆ خوداوەندیش هەر گەورەمانی و ئێمەش چیتر دزی ناکەین."

دزەکان هەرچی دزیبوویان گەڕاندیانەوە بۆ کاروانەکە و سەروماڵی خەڵکیان بۆ گەڕاندنەوە و تۆبەیان کرد. کاروانەکەش ڕێی بەغدای گرتەوە بەر.



# سێ کوژراوی تەماح

لەسەردەمی عیسا(ع)، سێ پیاو بەرێیەکدا دەڕۆیشتن. تووشی خەزێنەیەک بوون، وتیان: "یەکمان بڕوات و خواردنمان بۆ بهێنێت. یەکیان نارد. ئەو پیاوە ڕۆیشت و خواردنی کڕی. بەخۆی وت: "دەبێت ئەم خواردنە ژەهراوی بکەم تاوەکو ئەوان بیخۆن و بمرن و خەزێنەکە بە من بگات."

دووانەکەی تر وتیان: "کاتێک ئەو پیاوە بگەڕێتەوە و خواردنمان بۆ بهێنێت، بیکوژین تاوەکو خەزێنەکە بە ئێمە بگات."

کاتێک ئەو هاتەوە و خواردنی ژەهراوی بۆ هێنان، دووانەکەی تر کوشتیان، پاشان خواردنەکەیان خوارد و هەردووکیان مردن.

عیسا(ع) لەگەڵ حەوارییەکانی لەوێ تێدەپەڕی، وتی: "سەیر بکەن چۆن هەرسێ پیاوەکە لەبەر ماڵی دونیا کوژراون و، هەرسێکیشیان لێی بێ بەش بوون.

## هەردووکیان هی منن

دوو کەس لەسەر پارچە زەوییەک مشتومڕیان بوو.
هەریەکەو دەیووت: "هی منە."
چوون بۆلای عیسا(د).
عیسا(د) وتی: "زەوییەکە شتێکی تر دەڵێت."
وتیان: "چی دەڵێت؟"
وتی: "دەڵێت هەردووکیان هی منن."

* * *

شێخ ئەبوبەکری واستی ڕۆژێك دەچێت بۆ نەخۆشخانەیەك. چاوی بەشێتێك دەکەوێت کە هایت و هوویت دەکات و دەقیژێنێت، پێی وت: "ئاخر ئەو زنجیرە قورسەیان لەپێت بەستووەتەوە. ئەم دڵخۆشییەت لەچییە؟"
شێتەپیاو وتی: "هەی بێ ئاگا! هەی بێ ئاگا!" زنجیر لەپێم بەستراوە نەك لەدڵم.

*"عطار، تذكرة الاولیا"*

## تەماح

پیاوێکی ڕاوچی داوی دانـاو چـۆلەکەیەکی ڕاو کـرد. چـۆلەکەی وەقسەهات و وتی: "چیت لەگیانی من دەوێت؟! بڕوانە لە باڵ و پەڕو گۆشتی من؟؟؟ ئەوەندە کز و لاوازم کە تۆ تێر ناکەم. ئەگەر ئازادم کەی، سێ پەندی گرانبایید ئەدەمێ. پەندێکت کاتێك پێت ئەڵێم کە لە دەستت دام. پەندی دوهەم لە سەر لەقی دارێك پێت ئەڵێم و پەندی سێهەمیش کاتێك کە لە سەر لوتکەی کێو دانیشتووم."

ڕاوچی قبووڵی کردو وتی: "یەکەم پەندەکەت بڵێ!"

چۆلەکە وتی: "یەکەمین پەندم ئەوەیە: قەت داخ و سوێی شتێك کە لە دەس داوە مەخۆ!"

ڕاوچی بەڵێنەکەی بەدیهێناو ئازادی کرد.چۆلەکەکە بازێکی داو چو سەر لـەقی دارێـك و وتـی: "پەنـدی دووهـەم ئەوەیـە: بـڕوا بـە هـیچ قسەیەکی دوور لە ڕاستی مەکە!"

ئەوەی وت و بۆلای کێو چوو. لە کاتی فڕین دا وتی: "هـەی پیاوی چارەڕەش، لە چیکڵدانەی من دو گەوهـەری گرانبایی تێدایە بە کێشی چل مسقاڵ. گەر منت کوشتبایە، دەبوی بـە خـاوەنی گەوهـەرەکان، هەڵەیەکی گەورەت کرد!"

ڕاوچی پەژار بووەو بۆ ئەم گەوهەرانەی کە لەدەسی دابو خەفەتی زۆری خـوارد. دواتـر بـە چـۆلەکەی وت: "ڕاوەسـتە هێـشتا پەنـدی سێیەمت پێ نەوتوم!"

چۆلەکە وتی: "چۆن پەندی سێهەمت پێ بلێم لە کاتێکدا تۆ نەتوانیوە دوپەندی پێشو جێبەجێکەی؟! بە تۆم وت قەت داخ و سوێی شتێك کە لە دەس داوە مەخۆ، بەڵام تۆ سەبارەت بەوەی کە منت لە دەس داوە خەفەت ئەخۆی. بە تۆم وت بڕوا بە قسەی دورلەراستی مەکە، بەڵام تۆ بڕوات بەو قسەی من هێنا کە وتبووم، لە چیکڵدانەکەم دو گەوهەری چل مسقاڵی تێدایە. بۆ وا گەمژەیت؟ سەرجەم کێشی من دو مسقاڵ نابێ! چۆن ئەتوانم لە چیکڵدانەکەم گەوهەری چل مسقاڵیم هەبێ؟"

چۆلەکە ئەوەی وت و چوو راوچیەکەش بە داخ و ئۆفێکی زۆر ئەڕوانی لێی کە چۆن خەریکە دور ئەبێتەوە.

*"ئەتار نێیشابوری، ئیلاهی نامە"*

تێبینی: ئەو مەتەڵەیان بۆیە وتووە تاکو دەرکەوێ تەماح چۆن چڕنەبێ، مرۆڤ بڕوا بە گشت شتێ مەحاڵ دەکا.

# چ کەسێك هەژارە؟

پیاوێك بە ئیبراهیمی ئەدهەم وتی:

"ئەی کوڕی ئەسهاق دەمەوێ ئەو پارچەیەت بدەمێ و جل و بەرگێك بۆ خۆت چێبکەیت."

ئیبراهیم وتی: "گەر هەژار نەبی لێتی وەرئەگرم بەلام ئەگەر بی وەریناگرم."

وتی: "من بێنیازم"

ئیبراهیم وتی: "چیت هەیە؟"

وتی: "دوهەزار دینار"

ئیبراهیم وتی: "ئەتهەوێ ببێتە چوارهەزار دینار؟"

وتی: "بەڵێ"

وتی: "کەوایە تۆ هەژاری، پارچەی تۆ قبوڵ ناکەم"

## ئەوەش ویستنە

گێڕایانەتەوە کە ئەبوبەکری شەبلی وتبووی:
"ئەوەم دەوێ کە نەمهەوێ!"
ئەبولحەسەنی خەرەقانی ئەو قسەی کە بیست، وتی:
"ئەوەش ویستنە."

*"نفحات الانس"*

## سەربەستی و ئازادی

ڕۆژێك لە بازاڕی کوێلە فرۆشانی بەغدا، ئاگرێك کەوتەوەو گەلێك کەس سوتان.

لە ناو دوکانێکدا دو منداڵی هژمە"خولام" ی ڕۆمی بون کە ئاگرەکە دەوری دابوون. خاوەنەکەیان وتی:

هەر کەس ئەوان ڕزگارکا، هەزار دیناری مەغربی ئەدەمێ. کەس نەیوێرا ئەو کارە بکا.

لە ناکاو ئەبوالحەسەنی نوری بەسەردا هات و بینی ئەو دو منداڵە هاوار ئەکەن، وتی:

"بسم الله الرحمن الرحيم" و خۆی بە ئاگرەکە داداو هەر دو منالی بە سلامەتی هێنادەرەوە، خاوەنی دو هژمەکە هەزار دیناری مەغربی دا بە کابرای بوێرو وتی:

"پیاوەکە، تۆ توانیت ئەوان رزگار کەیت هەر بۆیە ئەم دینارانە پاداشتی فیداکاری تۆیە."

/ئەبولهەسەنی رۆمی روانییە خاوەن هژمەکان و زۆر بە هێمنی پێی وت: ئەو دینارانە لابەر شوکری خواکە چونکو ئەو پلەوپایەی کە بە منیان داوە لە وەرنەگرتن پێیان داوم/

*"عطار، تذکرةالاولیا"*



بەرزترین پلەی خەڵکی حەقیقەت دوور
بڕان لە خواستەکانیانە.

"ابوالحسن نوری"

## نیازو بێنیازی

پاشایەک تووشی گێچەڵێک بوو، وتی: ئەگەر بە ئاکامێکی دڵخواز بۆ من تەواو بێ، گەلێ درەم ئەدەم بە خەڵکی بە ئیمان، نیازەکەی بەدیهات و پێویست بوو پەیمانەکەی جێبەجێ بکات. هەر بۆیە توورەکەیەک درەمی دایە یەکێک لە فەرمانبەرانی تاکو لەنێوان خەڵکی بە ئیمان دابەشی بکات.

دەگێڕنەوە هۆمە "خولام" کە ژیر و وریا بوو و تەواوی ڕۆژ گەڕاو شەو هاتەوە بۆلای پاشاو توورەکەی درەمەکانی پێدایەو وتی:

"خەڵکی بە ئیمانم نەدۆزییەوە".

وتی: "ئەوە بەزمێکە، ئەوەندەی من دەزانم لەم شارە چوارسەد بەئیمانی تێدایە."

وتی: "ئەی خوای هەمو جیهان/ ئەوەی بە ئیمانە نایەوێ، ئەوەی دەیەوێ بێ ئیمانە"/

"سەعدی"

له هەر خەسڵەتێكدا سەركەوتم جگە لە
هەبیسی كه هەبیس بوون واته تەركی
مەیلی دنیا، دنیاش لای من بایەخێكی
نەبوو تاكو تەركی كەم و سەركەوم.
*"بایزید بستامی"*

## ئەسكەندەر و دیوژەن

ئەسكەندەری مەزن، فیلسووفی سەردەمی خۆی "دیوژەنی" بانگهێشتی كۆشكی خۆی كرد،
فیلسووف بەناوبانگ بۆ چوون بیانوی هێناوه.
هۆیەكەیان لێپرسی
به پەیامنێرەكەی وت:
"بڵێ بە ئەسكەندەر، هەمان شت كه ناهێڵێ تۆ بیت بۆ ماڵی من "پاشایەتی و بێ نیازی"، هەمان شتیش "قەناعەت و بێ نیازی" ناهێڵێ من بێم بۆ كۆشكی تۆ.

/ لەنێوان بەندەو خوا، ئاسمان و زەوی، ئەرش و کورسی پەچە نییە، پەچە، خەیاڵی پوچ و بەخۆنفشین و لەخۆبایی بوونە، ئەو کۆسپانە لادە دەگەی بە خوا./

"ابوسعید ابوالخیر"

## پەچەی خۆبینی

لە "شەبەلی" خواناسی بەناوبانگ پرسیاران کرد: "هەی شێخ لە کەیوە ڕووت هێنا بە ئیمان و خواپەرستی؟"

وتی: "ڕۆژێک لە گەڕەکێک تێپەڕ ئەبووم کە لە قراخ جوگەلەیەک سەگێکم بینی. ئەو ئاژەڵە دەیویست ئاو بخواتەوە، بەڵام کاتێک کە وێنەی خۆی لەناو ئاوەکەدا بینی وای زانی سەگێکی تر لەناوەکەدایە، هەر بۆیە دەترساو پاشەکشی دەکرد.

ئەو هات و چۆ کردنە کاژمێرێکی خەیاند. لە ئاکام دا سەگ سەری کردە ناو ئاوەکەو زانی کە سەگێتر لە ئارادا نییەو ئەو کۆسپەی کە نەیدەهێشت ئاو بخواتەوە هەر خۆی بوو.

بە بینینی ئەم دیمەنە تێگەییشتم کە پەچەو کۆسپی من بۆ گەییشتن بە بەختەوەری و کامەرانی خوبینی خۆمە، کەوایە لەمەوبەدوا بڕیارم دا کە خۆبین نەبم و هەر بیر لە خۆم نەکەمەوە تاکو بتوانم ڕێگای بەختەوەری بدۆزمەوە."

لە ئەبولحەسەنی خوراسانی سەبارەت

/بـــە دڵپاکی پرسیاران لێکرد، وتی:
نیازپاکی لـە کردەوەکانمان کاتێك
دەردەکەوێ کە مرۆڤ تەنیا بۆ خوای
کردبێ. /
*"دکتۆر نوربەخش، پیرانی خوراسان"*

## نیازی پاك

بازرگانێـك لـە نێیـشابوور بـوو کـە خـاوەنی مـاڵ و سـامان و قەرەواشێکی "کەنیز" جوان و ناسك بوو.

تووشـی سـەفەرێك هـات، هـەر بۆیـە قەرەواشـەکەی بـردە مـاڵی کابرایەکی بە ئیمان تاکو بە ئەرخەیانی بڕوات بۆ سەفەر.

ڕۆژێکی کابرای بە ئیمـان سەرنجی چوو لای جوانی قەرەواشەکەو دڵی ڕفاند. کاتێك کە ویستی لەگەڵی ڕابوێرێ، تێفکری و بە خۆیی وت، ئەی هاوار ئەو هەموساڵە نوێژو ڕۆژووت گرت ئێستاش گیرۆدەی هەوەس بوویت؟

کابرای بە ئیمان چوو بۆلای ئیماندارێك کە لەخۆی بەئیماندارتری دەزانی و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە.

ئیماندارەکە پێی وت: "براکەم تۆ پێویستیت بە سەفەرێکە تاکو بە خزمەتی کەسانی خاوەن بیروڕا بکەیت و ئەو حاڵەتە لە دڵت بسڕیتەوە. هەربۆیە بچۆ بۆ شاری "ڕەی" بۆ لای شێخ یوسف.

کابرای بە ئیمان چوو بۆ ڕەی و بەدوای ماڵی شێخ یوسف گەڕا.

خەڵكی ڕێی پێیان وت ئەو پیاوێكی بێئەخلاق و لە ڕێی خوا دەرچووە.

كەوای بیست كابرای بەئیمان گەڕایەوە بۆ نیشابوور و مەقایەتی شێخەكەی بۆ ئەو ئیماندارە گێڕایەوە، ئیماندار پێی وت: "براكەم گوێڕایەڵی قسەی خەڵك مەبە و بچۆ بۆلای شێخ."

كەوایە گەڕایەوە بۆ ڕێی و دەستی بە لێكۆڵینەوە كرد. هەرچی خەڵكی ڕێی پێیان وت كە ئەو كابرایەكی بێ دین و بێ ئەخلاقە، گوێڕایەڵی خەڵكی ڕواڵەتبین نەبوو و چوو بۆ هەر ئەو گەڕەكەی كە شێخی لێبوو، بینی بە زۆرینەی خەڵك لەو گەڕەكە بێ دین و بێ ئەخلاقن.

كابرای بە ئیمان لە دڵی خۆیدا وتی، ئەو قسەگەلەی كە خەڵك سەبارەت بە شێخیان دەوت ڕەنگە ڕاست بێ.

تاكو گەیشتە خزمەتی شێخ، بینی لاوێكیش لە ماڵەكەیێتی، كابرا واقی بردبۆوە، بوتڵە شوشەیەكیشی بینی وایزانی شەڕابە.

وتی: "بەڕێز شێخ بۆ هاتویتە ئاواگەڕەكێك كە خەڵكەكەی بە زۆرینە بێ ئەخلاق و بێ دینن؟"

شێخ فەرمووی: "ئێمە نەهاتوین بۆ ئەم گەڕەكە بەڵكو ئەو خەڵكە هاتون بۆ ئێرەو منیش دەسەڵات و هێزی ئەوەم نییە كە دەریانكەم."

وتی: "ئەو بوتڵە شوشەیە چی تێدایە؟" فەرمووی: "بروانە" كە تامی كرد زانی سركەیە.

پرسیاری كرد "ئەو كوڕە كێیە؟" وتی: "منداڵەكەمە" وتی: "ئەی شێخ خەڵك بۆچی سەبارەت بە تۆ قسەی هەڵیت و پەڵیت ئەڵێن؟"

/ شێخ فەرمووی: "براکەم چ زیانێکی هەیە، با بیڵێن، کۆتاییکەی ئەوەیە کە هەبیسیم"زەمەدی" لە ناو خەڵکی دەنگ ناداتەوەو بە بۆنەی پەرستەر بوونم ناوبانگ دەرناکەم و خەڵکی کەنیزەکەی بە من ناسپێرێو منیش شێت و شێیدای جوانی ئەو نابم و شار بە شار بەدوای شێخ یوسف دا ناگەڕێم." /

کاتێک کە کابرای بەشیمان بەسەرهاتی خۆی لەزاری ئەو بیست، تێگەیشت کە ئەو پیاوێکە لە دنیاو روالەت تێپەڕیووەو دڵی لەگەڵ مەزرەتی گەورەیە"خوا". لەم ساتە تووێڵی پڕ بوو لە ئارەقی شەرم و هەیاو بای ئەڵێن لەسەری چووەدەرەوەو بە ئیرادەیەکی بەهێز دەستی کرد بە پەرستن و بەندەیی کردن. ماوەیەکیش لای شێخ خزمەتی کرد تاکو بە پلەی بەرزتر بگات.



گەر کەسێك بە تۆ بلێ: تۆ مرۆڤێکی باشیت، ئەو قسەیە تۆ خۆشحاڵ دەکا، کەسێکیش پێت بڵێ مرۆڤێکی خراپی، بزانە کە هێشتا مرۆڤێکی خراپی.

*"ئەبوهاشم سۆزی"*

## سکاڵا لە ئیرادگرەکان

هەڵسوڕاوێك لە خوا دڵۆڤانێتی خوا بەریکەوت و ڕێگەیان پێدا بێتە ناو کۆڕی خواناسان و خووخدەی ناهەمزوەلانێت و فێری خووخدەی جوان و شیاو بێت.

کاتێك کە ئەو لەوێنەدەبوو ئیرادگەرەکان بەردەوام لە خراپی ئەویان دەوت و رایان دەردەبڕی کە ئەو هێشتا نەگۆڕاوەو هەر وەکو جارانە و ناتوانین بڕوای پێبکەین کە بۆتە هەبیس.

کابرا بەرگەی تان و تەشەری خەڵکی نەگرتوو، بۆلای پیاوچاکێك چوو تاکو لە ئیرادگرەکان لای ئەو گلەیی بکات.

پیاوچاك وتی: "چۆن شوکری خوا ناکەی چونکە تۆ لەوەی خەڵك باسی دەکەن باشتری؟"

/باش بیت و خراپەت بڵێن لەوە باشترە خراپ بیت و باشەت بڵێن نابینی خەڵك من بە باش دەزانن لەکاتێکدا تاوانبارم؟ ئەشێ من خەمبار بم تۆ بۆچی؟ /

کەسێک لە ئەبول ئەباسی مەسروقی
ئامۆژگارییەکی ویست، وتی:/ تێبکۆشە
ئەگەر هەق بین نیت، با خۆبینیش
نەبیت./

## خۆپەسەندی

خوای گەورە بەهەزرەتی موسا(د.خ) فەرموو:
"ئەی موسا داوای نهێنییەک"راز" لە ئیبلیس بکە!
ئەو قسەیە لەبیری موسا مایەوە تاکو ئیبلیسی بینیو پێی وت:
خوای گەورە بە منی فەرموو: تا داوای نهێنییەکت لێکەم،
ئەو نهێنییە بە من بڵێ.
ئیبلیس وتی:
"هەی موسا! ئەو قسەیەت لەبیر بمێنێ کە:
"من" نەڵێیت، تاکو وەک منت "لێنەیە"!

"منطق الطیر"

## لێبوردەیی و خۆشکێنی

میرفەندرۆسکی لە زانایانی سەردەمی سەفەوی بەهەمو زانست و پرمەندییەك كە هەیبوو، زۆر ساكار دەژیا. بەجۆرە كە لە دەشت و كێو رادەوەستاو كایەی منالآنی چاو لێدەكرد.

لای شائەباس باسی ئاكاری ئەویان دەكرد. رۆژێك شا بە میری وت: "بیستومە كۆمەڵێك لە زانایان هێمنی و مەندی خۆیان ناپارێزن و لە دەشت و كێو سەرقاڵی كایەی منالآن ئەبن."

میر فەرمووی: "من بەردەوام لەوێم بەڵام هیچ زانایەكم نەبینیوە!"

شا لە لێبوردەیی و خۆشكێنییەكەی سەرسام بوو.

"كشكول ابن العلم"

## ئەو مێشولەش تۆی، ئێمە هیچ نین

ئەو كات كە شێخەكەمان "ئەبوسەئید ئەبولخەیر" چوو بۆ نەیشابور، مامۆستا ئەبولقاسمی قەشێری شێخەكەمانی نەدیتبوو و هاشای دەكرد. شێخ ئەبولقاسم هەرچی بە زاری دەهات رێك بە شێخی ئێمەی دەوت..و شێخ هیچی نەدەوت. رۆژێك بە زمانیدا هات كە دەمێك نیە ئەبوسەئید خوای گەورەی خۆش دەوێت و خوای گەورەش ئێمەی خۆش دەوێت، جیاوازی لەوەدایە كە ئێمە لەم رێگایەدا دەست و پێین و بوسەئید مێشولە!

ئەم هەواڵەیان گەیاندە شێخ. شێخ بەو کەسەی وت، بچۆ لای ماموستاو پێی بڵێ: "ئەو مێشولەش تۆی، ئێمە هیچ نین، ئێمە لەم نێوەدا هەر نین." دەرویش گەڕایەوەو ئەم قسەیەی بە ماموستا وت، ماموستا بڕیاریدا لەم ساتەوە خراپەی شێخەکەمان نەکات.

"محمدبن منور، اسرارالتوحید"

## یەکڕەنگی و ڕووی

لە شێخ ئەبولحەسەنی خەرەقانی پرسیاران کرد: چۆن بزانین کەسێك ناخی پاك و یەکڕەنگە؟ وتی: کاتێك زمانی یەکڕەنگ و پاك بێت، چونکە هەر کەس زمانی پرژوبڵاو بێت، دڵ و ناخیشی پرژوبڵاو دبێت. مرۆڤە مەزنەکان وتویانە: "دڵ مەنجەڵەو زمان کەوگیر، هەرچی لە مەنجەڵ دابێ بە کەوگیریش هەمان شت دەگا، دڵ دەریایەو زمان قەراخی دەریا، دەریا کە شەپۆلی کرد، هەمان شت کە لەناو دەریایە دێنێتە قەراخ."

* * *

لە حەکیمێکیان پرسی مرۆڤ کەی دەتوانێ ببێتە پارێزگارێکی تەواو؟

وتی: "ئەوکات کە هەرچی لە ناخ و دڵیدایە بیخاتە سەر کەشەفێکو لە بازار بیگێڕێو شەرم لە کەس نەکات."

## دووپووویی

پارێزکارێك میوانی پاشایەك بوو، كە دانیشتن بۆ خواردن، كەمتەر لەوەی كە دەیویست خواردی، كاتێكیش بۆ نوێژ وەستا زۆرتر لەوەی كە باو بوو نوێژی كرد تاكو بە مرۆڤێكی زۆرباش باسی بكەن.

كاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، داوای ڕاخستنی سفرەی كرد تاكو خواردنێك بخوات، كوڕێكی هەبوو زۆر وریا بوو، وتی: "باوكە، پاشا بانگهێشتی كردی بەڵام خواردنت نەخوارد؟" وتی: "لە ماڵەكەیان شتێكی وەهام نەخوارد كە بەكار بێت." وتی: "كەوایە نوێژەكەشت قەزاكە چونكەو شتێكت نەكردووە كە بەكار بێ."

"سەعدی، گولستان"

## یەكڕەنگی

ڕۆژێك لە بەغدا سەرخۆشێك بە زەویدا كەوتبوو و لە سەرخۆشی هێزی ڕۆیشتنی نەمابوو.

شێخ جنید لای تێپەڕ بوو. سەرخۆشەكە چاوی بە شێخ كوتوو شێخیش ئەوی بینی.

سەرخۆشەكە شەرمەزار بوو، وتی:

"یا شێخ، خۆم ئاخم چۆنە، هەر ئەمەش پیشان ئەدەم، ئاخۆ تۆ ئەم جۆرە كە خۆت پیشان ئەدەی، ناخیشت هەر بەم جۆرەیە؟" شێخ بە

بیستنی ئەم قسەیە چاوی پڕ بوو لە گریان، ئەو کابرایەش چانسی تۆبەی هێناو گەڕایەوە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست.

* * *

زانایەك پیاوێکی بینی کە بە جلوبەرگی رازاوەوە قسەی ناهەموار پیسی دەوت. زانا پێی وت: لەو دو کارە یەکیان هەڵبژێرە، یا ئەوەیکە قسەکانت وەکو جلەکانت بێ، یان جلەکانت وەك قسەکانت بێ.

## بیرۆکەی پۆزەتیڤ

ڕۆژێك خواناسێك کەوانێکی بەدەستەوە بوو، تیرێکی بۆ چۆلەکەیەك هەڵداو بەڵام بەری نەکەوت. خواناس زۆر پەرۆش بوو. یەکێك لە هاوڕێکانی بەناوی ئبنی حەمدون لەوێ بوو، وتی: هەربژی خەلیفەی ڕۆژگار، خواناس وتی: خۆ تیرەکەم بەری نەکەوت بۆ پێم هەڵدەڵەی؟ ئبنی حەمدون وتی: من وامزانی تۆ بەئانقەست لێت نەداو بەزەییت پێداهاتەوە! چونکەو تۆ کابرایەکی خواناس و دلۆڤانی بۆ بەندەکانی خوا! خواناس ئەو ڕاڵەیەی بەلاوە جوان بوو هەربۆیە هەزار درهم خەڵاتی دایە.

*"علی صفی، لطایف"*

* * *

باس دەکەن ئیسا(ع) لەگەڵ خوێندکارانی لەلای کەلاکی سەگێک تێپەڕ بوون. خوێندکارانی وتیان: بۆنەکەی چەن ناخۆشە. ئیسا مەسیح فەرمووی: ددانەکانی چەن سپییە.

*"محمد غزالی، کیمیای سعادت"*



یەکێك لە پێغەمبەران داوای لە خوا کرد خەڵکی ئیدی تەشەری لێنەدەن. پەیامی بۆ هات، من ئەو خەسڵەتەم بۆخۆم دانەناوە، چۆن بۆتۆی دانێم.

*"شێخ بەهایی"*

## چ کاتێ کامڵ دەبین؟

قوتابییەکی سوقرات لێیپرسی:
"تێگەیشتن و زانایی من کەی کامڵ ئەبێ؟"
وتی: "ئەو کات کە بە پیاهەڵگوتنێك شادمان نەبیت و بە لۆمە کردنێکیش پەرۆش نەبیت"
قوتابی وتی: "من کەی وام لێدێت؟"
وتی: "ئەو کات کە چوار شتت هەبێ، دو گوێ کە قسەی بەنرخی گوێ لێبێت و دو گوێش کە کەڕ بێت و قسەی هیچ و پوچی نەزانگەل نەبیسێ."

وتیان:"کەی بەندە قایل دەبێت؟"
وتی: هەرکات لە چەرمەسەریدا شوکر
بکات نەک لەخۆشیدا."

## پێگەی قایل بوون

تایفەی رەندان دەسیان کرد بە تکوڵی کردنی دەروێشێك و جوێنیان پێ ئەداو تۆرانبوویان.

دەروێش لەلای پیری رێچکە سکاڵای کردو رەوشتەکەی خۆیی بۆ باس کرد:

پیر وتی: "رۆڵەکەم خەرقەی دەروێشان جلی قایل بوونیانە. هەر کەسێ لەو رەوشەدا خۆراگر نەبێت، پێشمارەو خەرقە بۆی هەرامە."

"سعدی"

* * *

یەکێك لە خواناسان پالەوانێکی بینی کە زۆر تورەو بێتاقەت بووە.

وتی: "ئەوە بۆ وای لێهاتووە؟"

وتیان: "فلانەکەس جنێوی پێداوە."

وتی: "ئەم بێهونەرە هەزارمەن بەرد هەڵدەگرێ بەلام بەرگەی قسەیەك ناگرێ!"

"سعدی، گلستان"

باس کردنی خراوی خەڵکی خۆی لە خراپترین خراویەکانە، کەسێك کە باس لە خراویەکانی خەڵکی دەکا دەبێ سەرەتا خراویـەکانی خوی باس بکاو چاکی بکات.

## نەبوونی دادپەروەری

یەکێك لە مرۆڤەمەزنەکان بە پاکداوێنێکی وت:
" رات چییە سەبارەت بەو فلانە پەرستارەی کە خەڵك قسەی زۆریان بۆ هەڵبەستووەو تەشەری زۆری لێ ئەدەن. "
وتی: "لە روالەتی خراپە نابینم، لە ناخیشی ئاگادار نیم."

# ٣

## خوا دلۆڤانە

**لە دنیایەکی پڕ لە دڕك لەگەڵ خوا ژیان کردن زۆر لەوە**

**خۆشترە کە لە بەهەشت**

**لەژێر سێبەری داری توبادا ئاگات لەوی نەبێ**

*"ابولحسن خرقانی"*

## سەلماندنی خۆ یان خوا؟

کەسێك هات بۆلای مەولانا شەمسەدینی تەوریزی و پێی وت:
"من بە بەڵگەوە بوونی خوا دەسەلمێنم!"
شەمسی تەوریزی پێی وت:
"پیارەکە! خوا سەلمێندراوە! سەلماندنی ئەو پێویستی بە بەڵگەوە نییە.
گەر دەتهەوێ کارێك بکەی، پلەوپایەی خۆت لای خوا بسەلمێنە دەنا ئەو بێ بەڵگە سەلمێندراوە."

*"فیه مافیه"*

## کەی شاراوە بووی تاکو بتدۆزمەوە؟

دەروێشێك لە شێخ ئەبوسەئیدی ئەبولخەیر پرسیاری کرد
شێخ لەکوێ بیدۆزینەوە؟
شێخ وتی:
"کوێت بۆ گەڕا کە نەتدۆزیوە؟
گەر لەروی راستی و دروستی هەنگاو هەڵێنی، لە هەر شتێك بڕوانی ئەو دەبینی."

* * *

**خواناسێك بۆ خوا دەپارایەوەو دەیوت:**

**"خوایا! هەی بەخشەر! ئاخر دەرگایەکم بەڕوو بکەوە!"**

**رابعە عەدەوییە ئەم قسەی بیست و وتی بە پیاوەکە:**

**"هەی بێئاگا ئەو دەرگایە کەی داخراوە؟!"**

*"عەتار"*



سی ساڵ ئەوەم کرد کە هاورێکەم دەیویست
سی ساڵ هاورێکەم ئەوە دەکا کە من دەمەوێ
*"بایەزید بەستامی"*

## بەدیهاتنی دوعا

ڕۆژێك دەروێشێك لە گوندێك تێپەر دەبوو. هەر لەو کاتەدا منداڵێك بۆلای لێواری سەربانێك هاتوو لەبەر چاوی خەڵکی گوندەکە کەوتە خوارەوە. دەروێش هەتا ئەم دیمەنەی بینی هاواری کرد: "ڕایبگرە!!". خێرایی داکەوتنی منداڵەکە کەم بوویەوە. دەروێش رایکرد بۆلای منداڵەکەو ئەوی لەنێوان زەوی و ئاسمان گرتەوە و لەبەر چاوی حەبەساوی خەڵکی، منداڵەکەی بەسلامەت پێیان دایەوە! خەڵکی بە دەوری کۆبونەوەو ئەویان بە نوێنەری خوا داناو هەرکامیان بە وەسف کردن ناوێکیان لەسەردانا. دەروێش داوای لە خەڵکی کرد بێدەنگ بن و وتی: "من هیچکام لەم شتانەی ئێوە باسی لێدەکەن نیم! من تەنیا بەندەیەکی ئاسایی ئەو خوایەم کە بە گیان و بە دڵ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوموو بە کردەوەش سەلماندومە، ساتێکیش ئەم دیمەنەم بینی داوای یارمەتیم لێکرد. تەمەنێك من گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بوومەو و ئەنجامم دەداو ئێستاش من داوایەکم لێکرد و ئەو ئەنجامیدا، کەوایە دەبینن کە ڕووداوێکی گرنگ نەقەوماوە"

دوایی دەروێش جانتاکەی بە شانی داداو لەبەر چاوی حەبەساوی خەڵکی گوندەکە لەناو تۆزی زەماندا ونبوو.

## کەرامەت چییە؟

بە شێخ ئەبوسەعیدی ئەبولخەیریان وت:

فلانەکەس بەسەر ئاودا دڕوا!

شێخ وتی:

ئاسانە، بۆق و باڵندە بچووکەکانیش بەسەر ئاودا دەڕۆن

بە شێخیان وت:

فلانەکەس دەفڕێ!

شێخ وتی:

زەرگەتەو مێشیش دەفڕن.

پێیان وت:

فلانەکەس لە ساتێکدا لە شارێك بۆ شارێکیتر دەچێ!

شێخ وتی:

شەیتانیش بە هەناسەیەك لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوە دەچێ. ئەو شتەنا بایەخێکی نییە. مرۆڤی جوامێر بە کەسێك دەڵێن کە لەگەڵ خەڵکی هەستێ و دانیشێ و بنواو وەکو ئەوان بژی و لەگەڵ گەلەکەی کڕین و فرۆش بکاو ساتێکیش لە خوا خافڵ نەبێ.

"محمدبن منور، اسرارالتوحید"

## لوتفی ئاسمانی

خواناسێك هەمووشەوێك هەر ناوی خوا لەسەر زاری بوو نوێژی بۆ دەكرد. شەوێك ئیبلیس لێی وەدەركەوتوو بۆ ئەوەی دڵساردی بكاتەوە بەتەشەر پێی دەوت: "تۆ كە هەموو شەوێك بانگی خوا دەكەی ئاخۆ وەڵامێكیش لەلایەن ئەو بۆت هاتۆتەوە؟

خواناس بە بیستنی ئەم راستیە بە پەرۆشی و دڵگرانی خەوت و ئیدی بانگی خوای نەكرد.

/ لە خەودا حەزرەتی خزری بینی كە پێی دەوت: "بۆچی ئیدی بانگی خوا ناكەی؟" وتی: "چونكەو هیچ وەڵامێكم لەو هەموو ئەڵڵە وتن و بانگ كردنە نەبیستەوە".

خزر فەرمووی: هەر ئەوەیكە دەتوانی ناوی ئەو بێنی سەر زمان زۆر شكور بكە چونكەو لە راستیدا هەر بە لوتفی ئەوە كە دەتوانی ناوی بێنی سەر زمان.

باوانم ئەوە بزانە كە زۆر نەزان و بێناگا هەبوون كە شیاوی ئەوە نەبوون ناوی بێنە سەر زمان و رێگەیان پێ نەدراوە/

/"خوای مەزن، چوارسەد ساڵ تەمەن و پاشایەتی و موڵكی دایە فرعەون، كە گشت ئەمانە بوو بە هۆی دوور كەوتن لە خوا، تەنانەت رۆژێكیش تووشی گێچەڵی نەكرد تاكو ئەوەك بیری ئەو بكاتەوە."

ئەو ژان و ئێشەی كە ئێمە بە تۆی دەدەین بیانوویەكە بۆ ئەوەی تۆ لە ئێمە نیزیكتر بیتەوەو باسی دڵت بۆ ئێمە بكەی و بگەیتە قوناخێكی ئاسمانی./

# لە پێناوی ڕاستی

کابرایەک سەبارەت بە چۆنێتی ناسینی خۆی بە نوری خوا باس دەکاو دەڵێ:

"سەرەتا بە دایک و باوکم وت تاکو خوام پێ بناسێنن."

وتیان: "ناساندمان"

کەوایە لای ئەوان نەمام.

دوای ماوەیەک گەڕامەوەو چوومە بەردەرگای ماڵ و لە دەرگامدا.

باوکم وتی: "کێیە؟"

وتم: "مناڵی تۆ!"

وتی: من مناڵێکم هەبو پێشکەشی خوام کرد.

شتی پێشکەش کراویش وەرناگیرێتەوە.

دەرگای لێ نەکردمەوە..

*"تذکرة الاولیا"*

# ئایینی بەندەیی

زەمانێکی خوڵامێکم کڕی.
لێم پرسی "ناوت چییە؟"
وتی: "تۆ بەچی بانگم دەکەی؟"
وتم: "چی دەخۆی؟"
وتی: "تۆ چیم دەدەیتێ؟"
وتم: "چی لەبەردەکەی؟"
وتی: "تۆ چیم لەبەردەکەی؟"
وتم: "چ کارێك دەکەی؟"
وتی: "چ کارێکم دەدەیتێ؟"
وتم: "چیت دەوێ؟"
وتی: "بەندە داوای هیچ ناکات"
کەوایە بە خۆم وت: "هەی کابرای داماو تۆ لە تەواوی تەمەنت ئاوا بەندەییت بۆ خوا کردووە؟"

*"ئیبراهیم ئەدهەم"*

# ڕزگاری

ڕۆژێک "عەبدوڵلا موبارەك" بە مەبەستی دیتنی بۆهلوول چوو بۆ سەحرا. گەیشتە لای ئەوو سڵاوی کرد و وتی:

"هەی بۆهلوول! داوات لێدەکەم پەندێك پێ بڵێی تاکو لە ژیانمدا تووشی گوناە نەبم لەبەرئەوەی من کابرایەکی گوناهکارم و ناتوانم دەرەقەتی ئەوسی خۆم بم. ڕێگایەکم پێ پیشاندا تاکو ڕزگاریم بێت.

بۆهلوول کە ئەم قسانەی بیست، پێی وت: "هەی عەبدوڵلا! من چوار مەرجم هەیە، ئەگەر تۆ ئەم چوار مەرجەت بەدیهێنا منیش پەندت دەدەمێ."

عەبدوڵلا موبارەك قبوڵی کرد و بۆهلوول وتی:

"مەرجی یەکەم ئەوەیەکە کاتێک گوناە دەکەی و فەرمانی خوا بەجێناهێنی ڕزقی ئەویش نەخۆی!"

عەبدوڵلا کە وای بیست، وتی:

"کەوایە ڕزقی کێ بخۆم؟"

بۆهلوول وتی: عەبدوڵلا! تۆ پیاوێکی ژیری، دەتهەوێ داوای بەندەیی بکی و ڕزقی ئەویش بخۆیت و بە پێچەوانەی فەرمانی ئەو بکەیت! خۆت ببە بە دادوەر، مەرجی بەندەیی کردن ئاوایە؟

بەڵام مەرجی دوهەم ئەوەیە کە هەرکات ویستت گوناە بکەی ئاگاداربە لە موڵکی ئەودا نەبی!

عەبدوڵلا وتی:

"بەڵام بۆهلوول! ئەمە لە مەرجی یەکەم ئاستەنگترە. هەموو شوێنێک موڵکی خوای گەورەیە. بۆکوێ دەتوانم بڕۆم؟"

بوهلوول وتی:

"وایە عەبدوڵڵا، کەوایە شیاو نییە ڕزقی ئەو بخۆیت، لە موڵکی ئەودا بیت و فەرمانی بەجێ نەهێنی!

بەلام مەرجی سێهەم ئەوەیە کە هەرکات ویستت گوناه بکەی، لە شوێنێک بیکە تاکو ئەو نەتبینێت، ئەو کات هەرچی ویست بکە."

عەبدوڵڵا وتی:

"بۆهلوول! ئەمە لە گشتی ئاستەنگترە. خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێک هەیەو لە هەموو شوێنێکیش هەیە."

بۆهلوول وتی:

"وایە، بەڵام مەرجی چوارەم ئەوەیە: کاتێک ئیزرائیل لەپڕایەکی بۆت هات تاکو فەرمانی خوا جێبەجێ بکات، پێی بڵێ برێک کاتت بداتێ تاکو بتوانی ماڵاوایی لە خزم و کەست بکەیت و توێشەی ئاخرەتت کۆ کەیتەوە، دوایی ڕۆحم لە گیان دەرکە!"

عەبدوڵڵا وتی:

"بۆهلوول! ئەمە لە ئاستەنگترین مەرجەکانە. ئیزرائیل کاتێک کە دێت هەناسەیەکیش مۆڵەتت ناداتێ."

بۆهلوول وتی:

"وایە عەبدوڵڵا! کەوایە چونکەو ڕزقی ئەو دەخۆیت و لە موڵکی ئەو دایت و لە هەموو کات و ساتێکیشدا ئەو تۆ دەبینێ و کاتێکیش کە فەرمانی مردنت دەردەچێ تەنانەت بەقەرا هەناسەیەکیش ناتوانی زیاتر

بمێنیتەوە، هەربۆیە لە خەوی بێئاگایی هەستەو هەولی ئاخرەتی خۆت بدەو کاری ئەمڕۆت مەخەیێنە بۆ سبەی تاکو لە رۆژی قیامەت پەژیوان نەبیتەوە"

*"جامع التمثیل"*

## نیازپاکی

ماوەیەك بوو کۆمەڵێك لە بەنی ئیسرائیلیەکان دارێکیان دەپەرەست، خواناسێك چونکەو ماڵەکەی لەو نیزیکیانە بوو ئاگاداری ئەم بابەتە بوو، تەورازێکی هەڵگرت و بۆلای دارەکە چوو تاکو بیبڕێتەوە.

ئیبلیس پێشی پێ گرت و وتی:

"بۆ دەتهەوێ کارێك بکەی کە هیچ قازانجێکی بۆت نییە، بۆ لەپێناو کارێکی بێسود دەست کێشاوەتەوە لە عیبادەتی خۆت؟"

بەردەوام ئیبلیس هەولی ئەوەی دەدا کە خواناسەکە لە کارەکەی پاشگەز کاتەوە. لە کۆتاییدا توشی دەمەقاڵە بوون. خواناس و ئیبلیس لێیان بوو بە شەڕ و دوای ماوەیەك ململانێ ئیبلیس شکستی خواردو بە زەوی داکەوت.

خواناس لە سەر سینگی دانیشت، ئیبلیس وتی: "من بەردە تاکو پێشنیارێکت پێ بڵێم، گەر بە دڵت نەبوو ئەوکات هەرچی ویستت بکا!

خواناس وتی: "بیڵێ"

ئیبلیس وتی: "تۆ پیاوێکی هەژاری، من هەموو رۆژێ دو دینارت بۆ دێنم تاکو خەرجی خۆت و هەژارەکانی تر بکەی، ئەم کارە لە بریەتی

دارەکە بۆ تۆ باشترە. گەر قبوڵی بکەیت هەموو ڕۆژێ دو دینار لە ژێر سەرینەکەن هەڵدەگری."

خواناس پێشنیاری ئیبلیسی قبوڵ کرد و لە بڕینی دارەکە پاشگەز بوویەوە. بە پێی بڕیارەکە خواناس ڕۆژی یەکەم و دوهەم دو دیناری لە ژێر سەرینەکەی هەڵگرت، بەڵام ڕۆژی سێهەم هەرچی گەڕا هیچی نەدۆزیەوە.

خواناس بۆ جاری دوهەم تەورازەکەی هەڵگرت تاکو دارەکە ببڕێتەوە. لە ڕێگادا دیسان توشی ئیبلیس بوو. ئەم جارەشەیان لێیان بووبە شەڕ، بەڵام بە پێچەوانەی جاری یەکەم، ئەم جارەیان خواناس شکستی خوارد و بە زەوی داکەوت. ئیبلیس لە سەر سینگی دانیشت و وتی: "گەر لە بڕینی دارەکە پاشگەز نەبیتەوە هەر ئێستا دەتکوژم."

خواناس داوای لێکرد بەربیدات و لێی پرسی: "چیبوو کە جاری یەکەم شکستت لە من خوارد بەڵام بۆ جاری دووهەم سەرکەوتو بویت؟"

/ ئیبلیس وتی: "چونکە تۆ جاری یەکەم لەبەر خواو بە نیازێکی پاک هاتی، توانیت من شکست بدەیت. ئێمە لەهەمبەر کەسانێک کە لەپێناو خوادا کارێک دەکەن بێتوانایین. جاری دوهەم تۆ ژبۆ دینارەکان هاتی بۆیە شکستت خوارد!"/

# خوا نلوۆڤانه

ڕۆژێك حەزرەتی موسا(ع) لە کێوی توور لە کاتی سەڵادا وتی:

ئەی خوای هەموو جیهان!

وەڵام هاتەوە: "لبیك"

دوایی وتی: "ئەی خوای فەرمانبەران!"

وەڵام هاتەوە: "لبیك"

دوایی وتی: "ئەی خوای تاوانباران! موسا(ع) بیستی: "لبیك، لبیك، لبیك!"

حەزرەتی موسا وتی: "خوایا! حیکمەتەکە لەچیدایە کە تۆم بە جوانترین ناوان بانگ کرد، جارێك وەڵامت دامەوە، بەڵام تا وتم: خوای تاوانباران، سێ جار وەڵامت دامەوە؟"

خوا فەرمووی: "ئەی موسا! زاناکان بە زانست و مەعریفەتی خۆیان و چاکەکاران بە کردەوە چاکەکانی خۆیان و فەرمانبەران بە فەرمانبەر بوونی خۆیان متمتنەیان هەیە، بەڵام تاوانباران جگە لە بەزەیی من بۆکوێ پەنابەرن.

گەر ئەوان لە بارەگای منیش بێهیوا بن، ببن بە پەنابەری بارەگای کێ؟"

## دەریای لێبوردەیی

شێخ ئەبولحەسەن خەرەقانی شەوێك نوێژی دەكرد، كە لەپڕ دەنگێك هات كە وتی:

"هەی ئەبولحەسەن، دەتهەوێ هەرچی سەبارەت بە تۆ دەزانم لای خەڵكی باسی بكەم تاكو بەردبارانت بكەن؟"

شێخ وتی: "خوایا، دەتهەوێ منیش هەرچی سەبارەت بە لێبوردەیی و كەرەمی تۆ دەزانم بە خەڵكی بڵێم تاكو ئیدی كەس كڕنۆش و سوجدەت بۆ نەكات؟"

نەوا هات: "نە تۆ باسی كەو نە من."

*"عەتار نەیشابووری"*

## دەبێ بە ئاڵتون بینوسی

## "وتەو قسەکانی شێخ ئەبولحەسەنی خەرەقانی"

* ئەو کەسانەی کە لەسەر زەوی دەڕۆن،
ئەوانە مردووکان و
ئەو کەسانش کە لە ژێر خۆڵدا نوستون
ئەوانە زیندوکانن.

* بەندەی باش ئەوەیە کە هەر دو دەستی ڕاست بێ،
واتە هەرچی بەو دو دەستە دێیکا کردەوەی باش بێ،
تاکو ئەو شتەی فرشتەکان لە دەستی ڕاستی دەنوسن
هیچ جیاوازییەکی دەگەڵ نوسینی فرشتەکانی دەستی چەپی نەبێت.

* هەرچی دنیات زیاتر بوێت،
دنیا لەسەرت زاڵترە.
کاتێکیش وازی لێبێنی،
تۆ بەسەریدا زاڵ دەبی.

* باشترین شت،
دڵێکە کە هیچ خراپیەکی تێدا نەبێ.

* لێیان پرسی "دڵپاکی" چییە؟ وتی:

"هەر شتێك لەپێناو ڕاستیدا بکەی، دڵپاکیەو

هەر شتێکیش بۆ خەڵکی بکەیت، سەرۆکایەتیە."

* خوایا کەلەکەت شوکری نیمەتەکانی تۆ دەکەن،

من شوکری تۆ دەکەم.

نیمەت، هەبوونی تۆیە.



## وتووێژی جەبرەئیل و میکائیل

جەبرەئیل وتی:

"من زۆرم پێسەیرە کە بەم گشتە بێزێزی و زوڵمی ئەو گەلە،

خوای گەورە، بەهەشتی لەبەرچی ئافراند؟"

میکائیل کە ئەم قسەیەی گوێ لێبوو وتی:

"من ئەوەم پێسەیرە خوا بەم گشتە دلۆڤانی و لێبوردەییەی کە بۆ بەندەکانی هەیە، لەبەرچی دۆزەخی ئافراندووە؟"

دەنگێك لە لایەن حەزرەتی عیزەت و بەرێز جەبەروتەوە هات:

"لە وتەکەی هەردوکتان ئەوەم زیاتر بەدڵە کە گومانی جوانتر بکا واتە رەحمەت و دلۆڤانی مەنی زیاتر لەبەر چاوبێ تاکو پق و توورەییکەم."

"کشف الاسرار"

## پێناسەی پێگەیشتن

زارۆکێك بووم کە سەبارەت بە پێگەیشتن پرسیارم لە گەورەیەك کرد، وتی: "لە نوسینەکاندا هاتووە کە سێ نیشانەی هەیە: یەکەم تەمەنی پانزە ساڵانی و دوهەم لە خەودا گان کردن و سێهەمیش دەرهاتنی موی بەر.

بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا نیشانەیەکی هەیە: ئەویش ئەوەیە کە لای خوای گەورە و مەزن خۆت لەوە زیاتر پیشان بدەی تائەوەیکە گیرۆدەی نەفس و هەوەسی خۆت بیت. ئەو کەسەش کە ئاوا نەبێت، زانایان بە پێگەیشتووی نازانن.

## متمانەی بە ئێمە بوو

شێخ عەبدوڵلا بن خەفیف بیرەوەری خۆی لە سەفەرەکەی حەجی ئاوا باس کردووە:

"ویستم بچم بۆ حەج. کاتێك کە گەییشتمە بەغدا ئەوەندە سەرم قاڵ بووم کە بیرم چوو سەردانی گەورەیەك بکەم. کە گەییشتمە بیابان، پەتێك و دۆڵچەیەکم پێ بوو. تینووم بوو، بیرێکم بینی، بەچکە ئاسکێك ئاوی لێ ئەخواردەوە، کاتێك چووم بۆ سەر بیرەکە ئاوەکە کەمی کرد.

وتم: خوایا! نرخی من لەو ئاسکە کەمترە؟

هەر وام وت لە گوێمدا دەنگێکم بیست کە وتی:

"هەی پیاو، ئەو ئاسکە پەت و دۆڵچەیەکی نەبوو، بڕوای بە ئێمە بوو."

"عطار، تذکرةالاولیا"

# چیرۆکەکانی متمانە کردن

براکانی یێسف کاتێك ویستیان یێسف بخەنە ناو بیرەکە، یێسف زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد. یەهود! یەکێك لە براکانی یێسف پرسی: "بۆ پێدەکەنی؟ ئێرەخۆ شوێنی پێکەنین نییە!"

/ یێسف وتی: "ڕۆژێکی بیرم لەوە دەکەردەوە کە بە بوونی براگەلی ئاوا بەهێز کێ دەتوانێ دوژمنیم لەگەڵ بکا!"/

/ ئێستاکە خوا هەر ئەو برایانەی خومی پێ پیشاندام تاکو جگە لە ئەو متمانەم بە کەسیتر نەبێ./

* * *

/ حەزرەتی موسا ددانی وەژان کەوت و سکاڵای لە خوا کرد. خوای گەورە فەرمانی پێدا کە لە فلأنە گیا کەڵك وەربگرێ. حەزرەت وای کردو چاك بووە.

جارێکیتر ددانی موسا وەژان کەوت و هەر ئەو دەرمانەی بەکار هێنا، بەلأم ددانی چاك نەبووە! ئەو هۆیەکەی لە خوا پرسی. ئەوا هات کە جارەکەی پێشو بە هیوای منەوە چوی، بەلأم ئەم جارەیان بە هیوای گیاکەوە چوی و لە من خافڵ بووی./

## دزی ئایین

ڕۆژێك دزێك پاكەتێكی دۆزیەوە كە تێیدا شتگەلی بە نرخی تێدا بوو و هەروەها ئایەت لكورسیێكیش پێی لكابوو. ئەو، پاكەتەكەی گەڕاندەوە بۆ لای خاوەنەكەی.
/هۆیەكەیان لێپرسی، وتی: "بە بڕوای خاوەنی ئەمماڵە، ئەم ئایەیە ماڵەكەی لە دەستی دز دوور رادەگرێ، من دزی ماڵم نەك دزی ئایین! گەر من ئەوەم نەگەڕاندبایەوە شك و دودڵی سەبارەت بە ئۆل لای خاوەنەكەی دروست دەبوو، ئەوكات من دەبووم بە دزی ئۆلیش."

*"كشف الاسرار خاجە عەبدوڵلا ئەنساری"*

# گەڕانەوە بۆلای ئەو

سەڵەفخۆرێك لە شوێنێك تێدەپەڕی. هەر لەم شوێنە منداڵگەلێك کایەیان دەکرد. کاتێك کە گەیشتە لای منداڵەکان، گشتیان بە یەکەوە وتیان:

لێی دوور بکەوینەوە تاکو تۆز و خۆڵی سەڵەفخۆر لەسەرمان نەنیشێ.

تاکو وەکو ئەو چارەڕەش نەبین. کابراکە ئەم قسانەی زۆر پێناخۆش بوو هەربۆیە چوو تۆبەی کرد.

که گەڕایەوە، منداڵەکان لەرێگادا بوون و بەیەکەوە وتیان:

با دوور بکەوینەوە تاکو تۆزی ئێمە لەسەر وی نەنیشێ.

تۆبەکار وتی: "خوایا لە ماوەی کاژمێرێك کە لەگەڵ تو ئاژ بوومەوە، ئاوی منت بە چاکی و دروستی پیشان داوەو دەنگی دەهۆڵی دڵەکانت بۆ من وەگڕخستووە."

# چیرۆکی تۆبەی عەترفرۆش

دەگێرنەوە هۆی تۆبە کردنی عەترفرۆش ئەوە بوو کە رۆژێك لە دوکانەکەی خەریکی خوێندنەوە بوو، دەروێشێك هاتە ژوور و چەن جار وتی الله اکبر، بەلام عەترفرۆش هەر بۆلای نەهات. دەروێش وتی:

"خاجە تۆ چۆن دەمری؟"

عەترفرۆش وتی: "هەر بەو شێوازەی تۆ دەمری!"

دەروێش وتی: "تۆ دەتوانی وەکو من بمری؟"

عەترفرۆش وتی: "بەڵێ"

دەروێش پیاڵەیەکی چێوی هەبوو، لەسەر سەری داناو وتی:

"الله" و مرد.

عەترفرۆش ئەمەی کە بینی پەشۆکاو و دوکانەی تێك داو، هاتە سەر مەسلەکی ئەو.

"جامی"

# قەباعەتی دزی

باس دەکەن دزێك بوو کە زۆر شارەزا بوو لە کارەکەی، گەر دەیهەویست دەیتوانی دەمامك بداتە سەر ئەستێرەگەڕۆکی کەیوان و یان دەماسك لەسەر ئەستێرەگەڕۆکی زۆهرە لادا، لە کەلێنی هەر کونێکەوە وەك شۆقی مانگ دەچوو ژوورەوە و لە قەڵشایی هەر دەرگایەك وەك تیشکی خۆر خۆی پێیا دەکرد.

پاشای شارەکە دەیهەویست بیگرێ، بەڵام هەلێك نەدەرەخسا بۆ گرتنی.

شەوێك هەر ئەو دزە بەپێی ڕەوشتی خۆی لە قەراخ دیوارێك خۆی شاردبووە تاکو لە ڕێبواران شتێك بدزێ. ڕوانی، کۆمەڵێك کەسی بینی کە ژنێکیان لەسەر پیاوێك بە زینا گرتبوون وبۆلای فەرمانداری ناوچەکە ڕایاندەکێشا.

ژنەکە هاواری کرد: هەی موسڵمانینە، نە قسەیەکی خراپم وتووە نە دزیم کردووە، چیتان لەمنی داماو دەوێت؟ ئەم قسەیە دزەکەی چاك تەمبێ کرد. لەگەڵ خۆی وتی: ئەمە.. ئەو کارەی کە من دەیکەم.. کارێك کە ژنێکی لەشفرۆش پێی شوورەییە کە بیکا. ڕۆیشت و لەم کارەی خۆی تۆبەی کردو ئیدی بۆلایدا نەچوو.

## دو شێوەی مردن

ڕۆژێك پاشایەك ویستی بچێت بۆ سوارکاری. فەرمانیدا جلەکانی بۆ بێنن. ئەوەی کە باشتر بوو لەبەری کرد و هەروەها چەن ئەسپیشیان بۆ هێنا. ئەسپێك لەوانیتر باشتر بوو، سواری بوو و لەگەڵ کۆمەڵێك لە سوارکارەکانی دەرچوو و ئەوەندە لەخۆبایی بوو کە چاوی لە کەس نەدەکرد. ئیزرائیل بە شێوازی دەروێشێك هاتە لای.

سڵاوی لێکرد، پاشا وەڵامی نەدایەوە. لقاوی ئەسپەکەی گرت، پاشا وتی:

"وازبێنە نازانی خەریکی چی دەکەی؟"

وتی: "پاشا من کارێکم پێتە" وتی: "ڕاوەستە تاکو دابەزم."

وتی: "نا، هەر ئێستا." وتی: "خێرا بیڵێ"

سەری بردە لای گوێی و پێی وت: "من ئیزرائیلم، هاتوم هەر لەم ساتەدا گیانت لێ بگرم."

پاشا ڕەنگی پێوا ئەماو زمانی لەکار کەوت و تی:

"بەس بێڵە بچمەوە ماڵ و لەگەڵ ژن و منالم ماڵاوایی بکەم."

وتی: "نا، هەر ئێستا گیانت دەگرم."

ئەوەی وت و گیانی لێسەند، پاشا لە ئەسپەکە کەوتە خوارەوە و ئیزرائیلیش ئەوێی بەجێهێشت.

ئیماندارێکی بینی، وتی: "دەمەوێ نهێنییەکت پێ بڵێم." وتی: "بیڵێ."

وتی: "من ئیزرائیلم."

وتی: "هەی بەخێربێی، زۆر درەنگ هاتی من نەمێژە چاوڕوانتم، هیچ کەس لە تۆ ئازیزتر نایەتە لای من، هەر ئێستا گیانم دەرکە."

وتی: "دانیشە، سەرەتا ئەگەر کار و پێداویستیەکت هەیە بیکە."

وتی: "هیچ کارێك لای من گرنگتر لە بینینی خوای خۆم نییە."

وتی: "هەرئێستا گیانت دەردەخەم."

وتی: "راوەستە با دەسنوێژ بگرم و نوێژ بکەم، تۆش لە سوجدە گیانم لێ بستێنە." ئەویش وای کرد.

*"غەزالی، کیمیای سەعادەت"*



## ڕاستی مەرگ: تاڵ یان شیرین؟

ئیزرائیل گەیشتە سەر بەئیمانێک،

پێی وت:

تۆ کێی؟

ئیزرائیل وەڵامی دایەوە:

"من لەناوبەری چێژەکانم و جووتەکان لەیەک جیادەکەمەوە"

کابرای بە ئیمان پێی وت:

هەی جوامێرا بۆ هەر خەسڵەتە خراپەکانت پیشان دەدەی و سەبارەت بە خەسڵەتە باشەکانت هیچ ناڵێی؟

ئیزرائیل وتی:

"خەسڵەتی باشم چییە؟"

ئیماندار وتی:

"تۆ مەڵاڵ دەگەیەنی بۆلای مەڵاڵەکەی!"

*"کشف الاسرار"*

## شوکر

جۆنەیدی بەغدادی هەوت ساڵان بوو کە بردیان بۆ حەج.

لە مزگەوتی الحرام سەبارەت بە شوکر قسەیان دەکرد و لەنێوان چوارسەد پیردا، چوارسەد وتاریان سەبارەت بە شوکر وت.

بە جۆنەیدیان وت: "تۆش شتێك بڵێ."

جۆنەید وتی: "شوکر ئەوەیە کە ئەو نیعمەتەی خوا بە تۆی داوە قەدری بزانی و نیعمەتی ئەو نەکەی بە سامانێك بۆ کاری خراپ."

جۆنەید هەرئەوەی کە وت، گشتیان بەیەکرا وتیان لەم قسەیە باشتر نییە.

*"عەتار"*



## ژماردنی نیعمەت

عەبدوڵڵا الفرج العابد دەڵێ:

لە ماوەی شەووڕۆژێك لە خۆمدا چواردەهەزار نیعمەتم ژمارد،

وتیان:

ژماردنەکەی چۆن بوو؟

وتی:

هەناسەی خۆم ژمارد،

لە شەووڕۆژێکدا چواردەهەزار هەناسە دەبوو.

*"ابوسعید ابوالفیر"*

## حەج هەر سوڕان بە دەوری بەردا نییە

کەسێك هاتە لای شبلی، شبلی پێی وت: "لە کوێوە دەی؟" وتی: "لە حەج بووم."

وتی: حەجت کرد؟ وتی: "بەڵێ."

وتی: "سەرەتا کە لە ماڵ چوویتە دەرەوە و ماڵاواییت لە نیشتمان کرد ئاخۆ لە گشت گوناهەکانیشت ماڵاواییت کرد؟" وتی "نا" وتی: کەوایە کۆچت نەکردووە."

وتی: چووی بۆ مەکە؟ وتی: "بەڵێ" وتی: ئاخۆ لە لایەن خوای مەزن ئاگادار کرایەوە بۆ چوون بۆ مەکە؟"

وتی: "نا". وتی: "کەوایە بۆ مەکە نەچوویت."

وتی: "چوویە ژوور حەرەمەوە؟" وتی: "بەڵێ" وتی: "لەکاتی چوونەژوورەوەت بەڵێنیتدا کە واز لە هەموو شت گەلی حەرام بێنی؟" وتی: "نا" وتی: کەوایە نەچوویتە ژوورەوە."

وتی: "کەعبەت بینی؟" وتی: "بەڵێ". وتی: "ئەو شتەی کە بەنیازی بویت بینیت؟ وتی: "نا". وتی: "کەعبەشت نەدیوە."

وتی: "سێ بەردەکەت هەڵاویشت و ئامادەی بەردی چوارم بویت؟"

وتی: "بەڵێ" کەوایە وتی: "لە دنیا رات کرد، بەم شێوازە کە تۆ بزانی لێی دور کەوتیتەوە و وازت لێهێنابێ دواجار بە هاویشتنی بەردی چوارەم هێور بوویتەوە و بەم هۆیش سپاسی خوات کردبی؟" وتی: "نا" وتی: "کەوایە بەردت هەڵنەداوە".

وتی: "لە سەفا هاتیتە خوارەوە؟" وتی: "ئەدی". وتی: "هەموو هۆیەکت لێ دورکەوتەوە بۆئەوەیکە سەفا بدۆزیتەوە؟" وتی: "نا". وتی: "کەوایە سەرنەکەوتوی لە سەفاو نەهاتیتە خوارەوە".

وتی: "عەرەفاتت تێپەڕ کرد؟" وتی: "ئەدی". وتی: "زانیت لەبرچی خولقێندراوی؟" وتی: "نا" وتی: "نەچوویتە عەرەفاتیش".

تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ ئەوەی بزانی چۆن لەمەوبەدواوە گشت ئەو کارانەربکەیت، ئێستاکە من حەجم بە تۆ ناساند بۆ ئەوەیکە هەرجارەی چووی بۆ حەج هەوڵ بدەی گشت ئەم کارانە بکەیت.

*"ابن عربی، فتوحات مکیه"*

## ٤

---

مرۆڤ

دەبێ دنیایەکی تر بونیات بنێین و

سەرلەنوێ مرۆڤ دروست بکەینەوە

"حافز"

# پێگە و پەیامی مرۆڤ

یەکێك وتی: "لێرە شتێکم فەرامۆش کردووە."

مەولەوی فەرمووی: لەدنیادا شتێك هەیە کە فەرامۆش ناکرێت، ئەگەر هەموو شتەکانی تر فەرامۆش بکەیت و ئەویان فەرامۆش نەکەیت، ئەوا جێی ترس نییە و ئەگەر هەموو شتێکی تر بەجێ بهێنیت و لەیادیان نەکەیت و ئەویان فەرامۆش بکەیت، ئەوا هیچت نەکردووە، هەروەکو پاشایەك تۆی ناردبێت بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو، تۆ بچیت و سەد کاری تر بکەیت جگە لەو کارەی کە بۆی چوبوویت، کەواتە تۆ هیچت نەکردووە.

کەوابوو مرۆڤ بۆ بەجێ هێنانی کارێك و بۆ مەبەستێك هاتووەتە سەر ئەم دنیایە، گەر بێت و ئەو کارە بەجێ نەهێنێت، وەك ئەوە وایە هیچی نەکردبێت.

## گەڕان بەدوای خەزێنەدا

مەولەوی لەمەسنەویدا، چیرۆکی پیاوێکی گێڕاوەتەوە کە بەدوای خەزێنەدا دەگەڕا و هەمیشە لەخودا دەپاڕایەوە و دوعای دەکرد کە: خودایە! خەڵکی ئەم هەموو خەزێنەیان کردووەتە ژێر زەوی و ئێستا مردوون و کەس کەڵکی لێوەرناگرێت، خەزێنەیەک پیشانی من بدە کە بیدۆزمەوە و تەمەنێک بەئاسوودەیی بەرمە سەر.

لەخەودا پێی وترا: دەچیت بۆ فلانە شوێن، لەسەر فلانە کێو و فلانە شوێن دەوەستیت، تیرێک لەکەوانەکەت دەهاوێژیت، لەهەر شوێنێک کەوت، خەزێنەکە لەوێدایە.

ئەو پیاوە هەموو کەرەستە و پێداویستییەکی هەڵگرت و چوو بۆ هەمان شوێن و بینی کە هەموو نیشانەکان ڕاستن، ئینجا تیرەکەی خستە سەر کەوان و وتی: "ئێستا بۆ کام لای بهاوێژم"، بیری کەوتەوە کە پێیان نەوتووە بۆ کام لای بهاوێژێت.

بەهەرحاڵ تیرەکەی بەلایەکدا هاویشت و، ئەو شوێنەی تیرەکەی لێکەوت بە پاچ و پێمەڕە هەڵیکەند، بەڵام هیچ لەگۆڕێدا نەبوو! سەرلەنوێ تیرێکی تری بەلایەکی تردا هاویشت، هیچ ئاسەوارێک نەبوو، باکوور و باشووری نیشانە گرت و دیسانەوە هیچی دەست نەکەوت.

گەڕایەوە بۆ مزگەوت و دەستی کردەوە بە دوعا و پاڕانەوە و دووبارە خەونی بینی، هەمان کەسی بینیەوە کە ڕێنمایی کردبوو، پێی وت: "ئەوە چۆن ڕێنماییەك بوو کە بۆ منت کرد، چەندەی گەڕام هیچم نەدۆزیەوە."

ئەو کەسە وتی: "من کەی بە تۆم وت کە تیرەکە بەهەموو هێزتەوە رابکێشیت و بیهاوێژیت؟ من وتم تیرەکەت بخەرە سەر کەوان و لەهەر شوێنێك کەوتە خوارەوە خەزێنەکە لەوێدایە."

کابرا ڕۆژی دواتر ڕۆیشتەوە و تیرێکی لەسەر کەوانەکەی سوار کرد و هەرلەجێوە بەریدایەوە، تیرەکە لەژێر پێی خۆی کەوت و ئەویش ژێر پێی خۆی کۆڵی، خەزێنەکەی دۆزیەوە.

لەزانایەکیان پرسی: مەبەستی مەولەوی لەگێڕانەوەی ئەم چیرۆکە چییە؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی: "و فی انفسکم افلا تبصرون" واتە خەزێنە لەخودی خۆتایە. بۆچی ئەمسەر و ئەوسەر دەکەیت؟

# مەبە بەچیرۆکنووس

خاجە عەبدولکەریم، خزمەتکاری شێخ ئەبوسەعید بوو. وتی: ڕۆژێک دەروێشێکی خۆمان لەگەڵمدا دانیشتبوو تاکو یەکێک لەچیرۆکەکانی شێخی بۆ بنووسمەوە.

کەسێک گەیشت و وتی: شێخ بانگی تۆ دەکات، ڕۆیشتم.

هەر کە گەیشتمە لای شێخ، شێخ پرسی:

"چیت دەکرد؟"

وتم: "دەروێشێک داوای چیرۆکی شێخی دەکرد، ئەوەم دەنووسیەوە."

وتی:

"ئەی عەبدولکەریم.. مەبە بە چیرۆکنووس، وەها بە کە خەڵک چیرۆکی تۆ بڵێنەوە."

*"محەمەد بن منەوەر، اسرار التوحید"*

## کردەوەی بایەزید

بایەزید بەستامی بەرێیەکدا دەڕۆیشت. گەنجێك بەدوای کەوتبوو، هەنگاو بەهەنگاو شوێنی دەکەوت و دەیووت: شوێنکەوتنی گەورەپیاوان ئاوا دەبێت.

شێخ پەستەکێکی لەبەردا بوو. گەنجەکە وتی: پارچەیەك لەم پەستەکەت بدە بەمن تاکو بەکفنەکەی خۆمی بدوورمەوە. بایەزید وتی: **گەر تۆ پەستەکی بایەزید لەبەر خۆت بکەیت، هیچ سوودێکی بۆ تۆ نییە، مەگەر کردەوەکانت کردەوەی بایەزید بن.**

* * *

حەسەن بەسری پۆلێك خەڵکی بینی کە لەسەر تەرمی پیاوچاکێك کۆببوونەوە، وتی: "بۆچی لەسەر تەرمەکەی کۆدەبنەوە، کاروکردارتان وەك ئەو بێت بۆ ئەوەی وەکو ئەو بن."

## شەرافەت

پیاوێك لۆمەی سوقرات-ی دەكرد كە گوایە سەربە خانەدانێكی بەشەرافەت نییە.

سوقرات وتی: "خانەدانەكەی من مایەی شەرمی منن و تۆش مایەی شەرمی خانەدانەكەتی."

* * *

عەرەبێكم بینی كە بەكوڕەكەی خۆی دەوت: "یا بني انك مسئول یوم القیامة ماذا اكتسبت ولا یقال انتسبت، واتە لێت دەپرسنەوە كە هونەرەكەت چییە، لێت ناپرسن كە باوكت كێیە؟"

*"سەعدی، گولستان"*

## هێزی هیمەت

مێروولەیەکیان بینی کە ناوقەدی هەڵبەستبوو
و کوللەیەکی دە هێندەی خۆی هەڵگرتبوو.
بە سەرسوڕماوی وتیان:
"سەیری ئەم مێرووە بکەن کە بەم لاوازییەی خۆی چۆن بارێکی وەها قورس هەڵدەگرێت؟"
لەگەڵ ئەوەی مێرووەکە گوێی لەمە بوو پێکەنی و وتی:
"پیاوینە، بار بەهێزی هیمەت و باسکی جوامێری هەڵدەگیرێت نەك بەهێزی جەستە و شان و مل پانی."

*"عەبدولڕەحمان جامی، بەهارستان"*

## هێزی ئیرادە

یەکێك لەخەلیفەکان لەمنداڵییەوە خووی بەگوڵ خواردنەوە گرتبوو.
ڕۆژێك بە پزیشکەکەی خۆی وت:
"چی بکەم ئەم خووەم تەرك بێت؟"
پزیشك وتی:
"ئیرادەیەك وەك ئیرادەی مرۆڤی بەرز"
وتی: "ڕاست دەکەیت."
ئیتر ئەم کارەی دووبارە نەکردەوە.

*"شێخ بەهایی"*

# غەفلەت

دەڵێن پیاوێک لەدەست وشترێکی سەرشێت هەڵدەهات و بەناچار خۆی هەڵدایە ناو چاڵێک و دەستی بەلقی دارێکەوە گرت کە لەسەر لێواری چاڵەکە ڕوابوو، هەردوو پێشی لەجێیەک گیر کرد.

لەم بەینەدا باشتر سەیری دەوروبەری کرد، هەردوو پێکەی لەسەر چوار مار دانابوو کە سەریان لەکون دەرهێنابوو. سەیری قووڵایی چاڵەکەی کرد ئەژدیهایەکی تۆقێنەری بینی کە دەمی کردبۆوە و چاوەڕێی کەوتنی ئەوی دەکرد. سەری بەرز کردەوە، جرجی ڕەش و سپی لقی دارەکەیان دەخوارد کە دەستی پێوە گرتبوو.

هەر لەپاڵ خۆی چاوی بە تەختێک هەنگوین کەوت، پەنجەیەکی لێدا و بۆلای دەمی برد، ئەوەندە بەتام و چێژی هەنگوینەکەوە سەرقاڵ بوو کە لەبیری چووبۆوە لەچ دۆخێکدایە، بیری لەوە نەکردەوە کە پێی لەسەر چوار مار داناوە و نازانێت کەی دەکەونە جوڵە و مشکەکان بێ وەستان لقی دارەکەیان دەبڕییەوە، لەگەڵ لێبوونەوەی لقەدارەکە کەوتە ناو دەمی ئەژدیهاکە. ئەو چێژە کاتییە تووشی غەفڵەتێکی وای کرد و پەردەی بەسەر عەقڵیدا کێشا تاکو مشکەکان لقی دارەکەیان تەواو بڕییەوە و کابرای داماو کەوتە ناو دەمی ئەژدیهاکە.

*"نەسروڵڵا مەنیشی، کلیلە و دمنە"*

## پیاو بەپلە و پایە گەورە نابێت

دەڵێن: ئەسکەندەر پیاوێکی گەورەی سوپاکەی لەسەر پۆستەکەی لادا و، لەسەر کارێکی سادە و ساکاری دانا.

ئەو پیاوە رۆژێك هات بۆلای گەورەی. ئەسکەندەر پێی وت:

"کارەکەی خۆت چۆن دەبینیت؟"

وتی:

"تەمەنی گەورەم درێژ بێت،

پیاو بەپلە و پایە گەورە نابێت.

ئەسکەندەر ئەم قسەیەی بەدڵ بوو، گەڕاندیەوە سەر کارەکەی پێشووی و پلەی بەرز کردەوە.

*"غەزالی، نصیحة الملوك"*

# نهێنی ژیانێکی شاد

"زنون"ی حەکیم، پیاوێکی خەفەتباری لەکەنار دەریا بینی کە خەمی دنیای دەخوارد. حەکیم پێی وت: "خەم لەدنیا مەخۆ. ئەگەر لەوپەڕی هێز و دەسەڵاتدا، لەناو کەشتیدا بوویتایە و کەشتییەکەت دەشکا و بەرەو نقومبوون ڕۆیشتبای، ئایا دوا ئاواتی تۆ ئەوە نەدەبوو کە ڕزگارت بێت و هەموو سەروەت و سامانەکەت لەدەست بدەیت؟"

وتی: "بەڵێ."

ئینجا پێی وت: " ئەگەر فەرمانڕەوای دونیا دەبوویت و هەموو کەسانی دەوروبەرت نیازی کوشتنی تۆیان بووایە، ئایا ئاواتی تۆ ڕزگاربوون لەدەستی ئەوان نەدەبوو، تەنانەت بەرامبەر بە لەدەستدانی هەموو دەسەڵاتەکەت؟"

وتی: "بەڵێ."

وتی: "ئێستا بیر بکەرەوە، تۆ هەمان خاوەن هێز و توانایت و هەمان پاشایت، کە سەروەت و سامانەکەت لەدەست داوە، بەڵام گیانت پارێزراوە."

کابرا بەو قسانە هێور بووەوە.

*"شفیق بەمایی"*

## دەبێت بە زێڕ بنووسرێت

## وتار و قسەکانی زەنونی میسری

زەنونی میسری دەڵێت: یەکێکم بینی کە بە ئاسماندا دەفڕی. وتم: چۆن گەیشتیتە ئەم ئاستە؟

وتی: پێم لەنەفس نا تاکو باڵم گرت.

- هاوڕێیەتی کەسێك بکە کە لەگەڵ گۆڕانی تۆدا نەگۆڕێت.
- هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە رواڵەتی گوزارشت لەناوەڕۆکی نەکات.
- وتیان دنیا چییە؟ وتی: ئەوەی تۆ سەرقاڵ بکات و لەحەق دوورت بخاتەوە.
- رەمزی خۆشبەختی من لەسێ شتدایە: چەندەی تەمەنم دەچێتە سەر، تەماحم کەمتر دەبێتەوە و، چەندەی ماڵ و موڵکم زیاد دەبێت، دەست و دڵ کراوەتر دەبم و، چەندەی پلە و پایەم بەرز دەبێتەوە، دڵنزمتر دەبم.
- شەرم لەخوا بکە کە ئەوەی پێت خۆش بێت داوای لێ دەکەیت، لەکاتێکدا ئەوەی خوا بەناپەسندی دەزانێت تۆ ئەنجامی دەدەیت.
- یەکەم رێگە بۆ گەیشتن بەخوا، خۆشەویستی و تەندروستییە.

- ئەوەی بەچاوی دەرس وەرگرتن سەیری دنیا نەکات، هێندەی ئەو غەفڵەتە، دڵی نابینا دەبێت.
- ڕۆژێك بەکەنارەکانی نیل-دا تێپەڕ دەبووم، گەنجێکم بینی کە زۆر دڵخۆش بوو، وتم: هەی غەریب.. سەریە کوێیت؟ وەڵامی دامەوە:

"غەریب" کێیە کاتێك کە هاوڕێیەتی خوا بکات؟

کێ تەنها دەبێت کاتێك کە خوا هاوڕێی بێت؟

هەمووان لەبارەی تۆبەوە پرسیاریان لێکرد، وتی: تۆبەی گشتی بەهۆی گوناهەوەیە و تۆبەی تایبەت بەهۆی خافڵ بوونە لەیادی خوا.



٥

## عەشق، خزمەت، میهرەبانی

عارف، عارف نییە گەر وەکو زەوی نەبێت
تاکو چاکە و خراپە بەسەریدا تێپەڕن
و وەکو هەور کە سێبەر دەخاتە سەر هەمووشت
و وەکو باران کە دەگاتە هەموو شوێنێك

*"جنید بغدادی"*

## ئاسانترین ڕێگەی گەیشتن بەخودا

پرسیاریان لەشێخی ئێمە کرد
کە مەودای گەیشتن بەخودا چەندە،
وتی:
"لەهەزار ڕێگە زیاترە و هێندەی ژمارەی بوونەوەران ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بە خودا،
بەڵام هیچ ڕێگەیەك نزیکتر و باشتر و ئاسانتر لەوە نییە کە دڵی باوەڕدارێك خوش بکەیت و ئێمە بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتین و ئەمەمان هەڵبژارد و ئەم ڕێگەیە بۆ هەمووان پێشنیار دەکەین".

*"محەمەد بن مەنوەر، اسرار التوحید"*

## سەردانی کردنی خوداوەند

خوداوەند بە حەزرەتی موسای وت:
ئەی موسا من نەخۆش بووم، بۆچی نەهاتی بۆ سەردانی کردنم؟!
حەزرەتی موسا وتی:
خودایە.. تۆش نەخۆش دەکەویت؟!
جواب هات: "بەڵێ، فلان بەندەی من، هاوڕێی من لەفلان شوێن نەخۆش کەوتووە، نەچوویت بۆ سەردانی! واتە لەڕاستیدا نەهاتووی بۆ سەردانی من."

# حەجی گشتی، حەجی تایبەت

"عەبدوڵڵا موبارەك" كە لەحەج گەڕابۆوە سەعاتێك خەوت و لەخەودا بینی كە دوو فریشتە لەئاسمانەوە دابەزین. یەكیان لەوی تری پرسی كە "ئەمساڵ چەند كەس هاتووە بۆ حەج؟" ئەوی تریان وتی: "شەش سەد هەزار كەس." وتی: "چەندیان حەجەكەی قبوڵ بوو؟"

وتی: "كەسیان حەجی لێ قبوڵ نەكرا."

عەبدوڵڵا كە گوێی لەمە بوو، تووشی دڵەڕاوكەیەك بوو و وتی: "ئەم هەموو خەڵكە كە لەگۆشە و كەناری جیهانەوە، بە چەندەها ڕەنج و ماندووبوونێکەوە هاتوون، هەمووی پووچەڵ بوو؟"

ئینجا فریشتەكە وتی: "لەشاری دیمەشق پینەچییەك هەیە كە ناوی عەلی بن مۆفەق-ە، ئەو نەهاتووە بۆ حەج، بەڵام حەجی ئەو قبوڵە."

كاتێك گوێی لەمە بوو لەخەو ڕاچڵەكی و چووە دیمەشق، تاكو ئەو كەسەی پەیدا كرد و بانگی كرد، كەسەكە هاتە دەرەوە، وتی: "ناوت چییە؟" وتی: "عەلی بن مۆفەق." وتی: "قسەیەكم لەگەڵ تۆدا هەیە."

وتی: "فەرموو." وتی: "تۆ چیت كردووە؟" وتی: "سی ساڵ بوو ئارەزووی حەج چوونم دەكرد و بە كاری پینەچێتی سێ سەد و پەنجا درهەمم كۆكردەوە. ئەمساڵ بەنیازی حەج بووم. ڕۆژێك كە ژنەكەم دووگیان بوو، بۆنی تەعامێكی بەسەردا هات، بە منی وت: "بڕۆ هەندێك لەو تەعامەم بۆ بهێنە." منیش چوومە بەر دەرگای دراوسێ. دراوسێكەم گریا و وتی: "سێ شەو و ڕۆژ بوو كە منداڵەكانم هیچیان

نەخواردبوو، ئەمڕۆ چاوم بە کەرێکی تۆپیو کەوت، هەندێک گۆشتم لەلاشەکەی کردەوە و کردم بەخواردن، حەلاڵی ئێوە نییە." لەگەڵ بیستنی ئەمە ئاگر بەربووە گیانم. ئەو سێ سەد و پەنجا دینارەم هەڵگرت و دام بەو. وتم: "بیکە بە نەفەقەی منداڵەکانت کە ئەمە حەجە بۆ من!"

*"عەتار نەیشابووری"*



## بەزەیی هاتنەوە بە مێروولە

بایەزید بەستامی کە لە مەکە دەهاتەوە
گەیشتە هەمەدان،
تۆوی گوڵی (عصفر)ی کڕیبوو.
هەندێکی خستە باخەڵی و هێنایەوە بۆ بەستام.
کاتێک سەیری کرد مێروولەیەکی زۆر کەوتبووە ناو تۆوەکە.
وتی: "ئەمانەم لەشوێنی خۆیان ئاوارە کردووە!"
هەستا و مێرووەکانی گەڕاندەوە بۆ هەمەدان و لەوێ کە زێدی خۆیان بوو جێی هێشتن!

*"عەتار نەیشابووری"*

## بەخشش

خەڵك چوار بەشن: بەخشندە، جوامێر، چاوچنۆك، بێ نرخ.
بەخشندە ئەو كەسەیە كە خۆی بخوات و بدات بە خەڵكیش،
جوامێر ئەو كەسەیە كە خۆی نەخوات و بدات بە خەڵك،
چاوچنۆك ئەو كەسەیە كە خۆی بخوات و نەدات بە خەڵك،
بێ نرخ ئەو كەسەیە كە نە خۆی بخوات و نە بدات بە خەڵك.

*"پێغەمبەری ئیسلام (ص)"*

* * *

وابەستەی هەر كەسێك بیت،
دەبیت بە بەندەی ئەو كەسە.
لەهەر كەسێك بێ منەت بی
وەكو ئەوت لێدێت.
دەستخۆشانە بدەیت بەهەر كەسێك،
دەبیت بەفەرمانڕەوای.

*"حەزرەتی عەلی (ع)"*

دڵ گەورەیی، بەخشینی ئەو شتەیە کە

کاتی تەنگانە پێویستت بێت.

*"مەعروف کەرخی"*

## خوڵق و خووی دەروێشی

پیاوێك بە شەقیقی بەلخی وتی:

"دەروێش و هەژارەکانی ئێوە چۆنن؟"

"ئەگەر شتێکیان دەست بکەوێت، دەیخۆن و ئەگەر نەشبێت، سەبر دەکەن."

کابرا وتی:

"خۆ سەگەکانی بەلخ-یش هەروا دەکەن!"

شەقیق وتی:

"کەوابوو ئێوە چۆنن؟"

وتی: "گەر شتێکمان کەوتە دەست دڵی کەسانی تری پێ شاد دەکەین و دەیبەخشین، گەر نەشبوو سوپاسی یەزدان دەکەین."

لەگەورەیەکیان پرسی: "کێ جوامێرە؟"
وتی: "ئەوەی ببەخشێت و لەیادی بکات."
*"نصيحة الملوك"*

## بەزەیی

ژنی جوامێرێک بەمێردەکەی خۆی وت: "ئایا ئەم هاورێیانەت نابینی کە لەکاتی دەوڵەمەندیدا چۆن لەدەورت کۆ دەبنەوە و لەکاتی تەنگانە و هەژاریشدا لێت دوور دەکەونەوە؟"

مێردەکەی وتی: "ئەمە گەورەیی و چاکەی ئەوانە کە کاتێک دەزانن دەستم دەڕوات دێن بۆلامان بۆ ئەوەی چاکەیان لەگەڵدا بکەین و کاتی تەنگانە وازمان لێ دەهێنن."

*"شێخ بەهایی"*

## دوو جۆر مامەڵە

"حەسەنی کوڕی سەهل" توانی بچێتە خزمەتی مەئمون. مەئمون پێی وت: "تاچەند ئاشنای مرۆڤایەتی؟"

وتی: "ناتوانم وەڵام بدەمەوە، چونکە نازانم مەبەستی میری باوەڕداران لەو پرسیارە چییە.

مەئمون وتی: "بڕۆ بۆلای عەمروکوڕی مەسعەدە تاکو پەروەردەت بکات."

حەسەن دەڵێت: چووم بۆ ماڵی عەمرو. لەکاتێکدا ژمارەیەك کرێکار سەرقاڵی کارێك بوون و خۆیشی لەسەر خشتێك دانیشتبوو و سەیری ئەوانی دەکرد. سڵاوم لێکرد و وتم: "میری باوەڕداران تۆی ئەرکدار کردووە کە فێری مرۆڤایەتیم بکەیت." ئەویش داوای خشتێکی تری کرد و منی لەسەر دانیشاند و تێر قسەی بۆ کردم.

من بەهۆی ئەو مامەڵە ناخۆشەی زۆر زویر بووم، لەبەر ئەوەی وەك پێویست ڕێزی منی نەگرت و پێشوازییەکی باشی لەمن نەکرد. پاشان بەخزمەتکارێکی خۆی وت: "هیچ خواردنێکمان هەیە لەماڵەوە؟" وتی:

"بەڵێ". دوای ماوەیەك هێنای کە دوو نان و سێ قاپی بچووك بوو، قاپێکیان هەندێك سرکە و ئەوی تر هەندێك سەوزە و سێهەم قاپ خوێی تێدابوو، لەبەردەستی ئێمەی دانا. بەیەکەوە خواردمان، پاشان خزمەتکارەکە هاتەوە، ئاوی هێنا و ئێمەش دەست و دەموچاومان شۆرد. ئینجا بەمنی وت: "ئەگەر بەتەمای ڕۆیشتنیت خۆت دەزانیت."

حەسەن وتی، لەجێی خۆم هەستام لەکاتێکدا تووڕەیی سەرتاپای گیانمی داگیر کردبوو. خۆم بەزۆر ڕاگرت و هیچم نەوت، بەڵام خواحافیزیم لەو نەکرد. ئەو بە منی وت: "ئەگەر پێت خۆش بوو فڵان ڕۆژ وەرەوە بۆ ماڵمان. جارێ هیچ شتێك بۆ مەئمون باس مەکە."

وتم: "کێشە نییە". لەگەڵ گەیشتنی ڕۆژی دیاریکراو چوومەوە بۆلای. کاتێك گەیشتمە بەر دەرگای ماڵەکە، بانگیان کردمە ژوورەوە. هات بۆ پێشوازیم و باوەشی پێدا کردم. تێر ڕوومەت و ناوچەوانی منی ماچ کرد، ئینجا بەڕێزەوە لەدواوەی من ڕۆیشت و چووینە ژووری میوان. لەشوێنی تایبەتی خۆی منی دانیشاند، خۆیشی بەرامبەر من دانیشت و زۆر بەخێرهاتنی کردم. ئەوەندە ڕێزی منی گرت کە بەدرێژایی تەمەنم ڕۆژی وام بەخۆمەوە نەدیبوو.

لەکاتی نان خواردن بە فەرمانی ئەو سفر ڕاخرا، کە هەر زوو بە جۆرەها میوە و خۆراکی ڕازێنرایەوە. کاتی ماڵئاوایی کردن فەرمانی کرد بڕێکی زۆر زێڕ و زیو و فەرش و جلم بۆ ئامادە بکەن و ئەسپێکی تیژڕەویشیان بۆ ئامادە کردم، دواتر ژمارەیەك غوڵام و کەنیزەی خۆی لەگەڵمدا ڕەوانە کرد و بەمنیان وت:

"ئەگەر برایەکت رووی کردە ماڵت خۆت مەخەرە زەحمەتەوە و قەناعەت بەوە بکە کە لەماڵەوە هەیە. بەڵام ئەگەر رۆژێک کەسێکت بەتایبەت بانگهێشت کرد، ئەوەندەی لەدەست و تواناتدا هەیە ئامادەی بکە و بەوپەڕی رێزەوە پێشوازی لێبکە، هەروەکو دیداری تۆ لەگەڵ من لەیەکەم رۆژ و مامەڵەی ئەمڕۆی ئێمە کە تۆمان بانگهێشت کرد."

حەسەن وتی: "ئەو رۆژە زانیم واتای مرۆڤایەتی و جوامێری چییە!"



# چاکە لەوەڵامی خراپەدا

بازرگانێک سێ کوڕی هەبوو و دەیویست جێگرەوەی خۆی دەستنیشان بکات.

هەموویانی بانگ کرد و پرسیاری باشترین کاروکردەوەیانی کرد، کە لەچەند هەفتەی دواییدا ئەنجامیان داوە.

یەکیان وتی: "بازرگانێک خشڵە گرانبەهاکانی خۆی لای من بە ئەمانەت جێهێشت و، بڕەکەشی نەدەزانی. ئەگەر پارچەیەکیم لێ هەڵبگرتایە، بەئاسوودەیی دەژیام، بەڵام من ئەو کارەم نەکرد."

باوکی ستایشی کرد و بە رەوشت بەرزی کوڕەکەی خۆشحاڵ بوو. پاشان کوڕی دووەمی قسەی کرد: بەپێی دەڕۆیشتم. منداڵێکم بینی کە دەڕۆشت و لەپڕ کەوتە ناو جۆگەیەکی ئاو، خێرا رۆیشتم و رزگارم کرد."

لەکۆتاییدا کوڕە هەرە بچوکەکەی وتی: "بەسەر شاخێك دەکەوتم. پیاوێکم بینی کە زۆر لەگەڵمدا خراپ بوو و جاروبار ئازاری دەدام. ئەو پیاوە لەقەدپاڵێکی شاخەکە خەوتبوو، کە مەترسی زۆری هەبوو و ئەگەر لەوێ جێمهێشتبا بەڵایەکی بەسەر دەهات. بەڵام من چووم و لەخەو هەڵمستاند."

باوکی وتی: "کوڕم تۆ شایەنی ئەوەیت جێگرەوەی من بیت. تۆ چاکەت لەگەڵ کەسێکدا کردووە کە خراپەی بەرامبەر تۆ نواندووە."

هەموو بینایەك شایەنی رووخانە، بێن خۆشەویستی نەبێت، کە زۆر پتەوە.

## بەهۆی خۆشەویستییەوە...

رۆژێك جووتیارێك دانیشتبوو، هاورێیەکی خەیاری نۆبەرەی بۆ هێنا، جووتیارەکە حسابی ماڵەوەی جیا کردەوە و خەیارێکی دا بە کارەکەرەکەی، کە بە پێوە وەستابوو، جووتیارەکە خۆی نەیخوارد.

کارەکەرەکە خەیاری دەخوارد، کابرای جووتیار ئیشتیهای خەیاری کرد، پێی وت: قەپاڵێك لەو خەیارە بدە بە منیش، کارەکەر بەشی ئەویشی دا.

لەگەڵ ئەوەی جووتیار دەمی بۆ خەیارەکە برد، بینی زۆر تاڵە. وتی: غولام، ئەم خەیارە تاڵە چۆن وا خۆش دەخۆیت؟ وتی: ئەو دەستی خۆشەویستییە کە زۆر شتی شیرینی بە من داوە، بەهۆی شتێکی تاڵەوە گلەیی چی بکەم."

*"محمد منور، اسرارالتوحید"*

## خووی نەرم

ڕۆژێك شێخ ئەبو سەعید ئەبو خێر لەگەڵ پۆلێك سۆفی گەیشتنە لای ئاشێك. هاوساری ئەسپەكەی ڕاكێشا و سەعاتێك پشووی دا. ئینجا وتی: "دەزانن ئەم ئاشە دەڵێت چی؟ دەڵێت تەسەوف ئەوەیە كە منی تێدام، شتی درشت وەردەگرم و بەوردی دەیدەمەوە، كەوابوو كاتێك كەسێك قسەی ڕەق بوو، تۆ بە نەرمونیانی وەڵامی بدەوە و ئەگەر خراپەی كرد تۆ چاك بە."

* * *

ڕۆژێك حەزرەتی مەولانا جەلالەدین بە گەڕەكێكدا تێدەپەڕی، دوو كەس مشتومڕیان بوو و جنێویان بەیەكتر دەفرۆشت، یەكیان بەوی تری دەوت: "وەڵڵاهی هەر قسەیەكم پێ بڵێیت سەد قسەت پێ دەڵێمەوە." مەولانا چووە پێش، فەرمووی: "وەرە هەرچی قسەت پێیە بەمنی بڵێ كە ئەگەر هەزارم پێ بڵێیت، یەك نابیستەوە، هەردووكیان سەریان شۆڕ كردەوە و ئاشت بوونەوە."

گەر یەکێك بەخۆشەویستی خۆت
کۆت و بەند بکەیت لەوە باشترە

کە هەزار کۆیلە ئازاد بکەیت
*"عەلائەدین سمنانی"*

## دلۆڤانی هونەرە

دەگێڕنەوە کە شێخ بایەزید بەستامی شەوێك لەگۆڕستان دەگەڕایەوە. گەنجێك لەخانزادەکانی بەستام سازی دەژەنی. کاتێك لەشێخ نزیك بۆوە، شێخ وتی: "لا حول ولا قوه الا بالله"
گەنجەکە، سازەکەی گرت و لەسەری شێخیدا شکاند. شێخ گەڕایەوە حوجرەی خانەقا و بەیانی زوو پارەی سازە شکاوەکە و تەبەقێك حەلوای نارد بۆ ئەو گەنجە، وتی: پێی بڵێن کە بایەزید داوای لێبوردن دەکات و دەڵێت کە سازەکەت لەسەری ئێمەدا شکاند، ئەم پارەیە بگرە و یەکی تر بکڕەوە و ئەم حەلوایەش بخۆ تاکو ئەو خەفەتە لەدڵت دەربچێت!
گەنجەکە کە ئەمەی بیست، هات و بەپێی شێخدا نووسا و تۆبەی کرد و زۆر گریا.

*"عطار، تذکرةالاولیاء"*

## دەبێت بەزێڕ بنووسرێت

## "وتەکانی بایەزید بەستامی"

☐ ئەوەی داوای بەهەشت بکات پیاو نییە،
پیاو ئەو کەسەیە کە بەهەشت داوای بکات.
ئەوەی لەئاگری دۆزەخ رابکات پیاو نییە،
پیاو ئەو کەسەیە کە ئاگری دۆزەخ لێی رابکات.
ئەوەی داوای خودا بکات پیاو نییە،
پیاو ئەو کەسەیە کە خودا داوای بکات.

☐ پرسیاریان لەبایەزید کرد:
"نیشانەی خۆشەویستی خوداوەند چییە؟
وتی: نیشانەی ئەوەی کە خوداوەند یەکێکی خۆش بوێت،
ئەوەیە کە سێ خەسڵەتی پێ دەبەخشێت: دڵێکی فراوان بەپانتایی دەریا،
بەزەییەك وەك بەزەیی خۆر و دڵنزمییەك وەکو دڵنزمی زەوی.

☐ ئەوەی خۆی لەفیرعەون
بە باشتر بزانێت موتەکەبیرە.

☐ ئەوانەی زۆر دوورن لەخوداوەند
کەسانێکن کە خۆیان زۆر بە نزیك
لەو دەزانن.

لەداناکانیان پرسی: " سەفەری کێ
درێژترە؟"
وتی: "ئەو کەسەی بەدوای هاوڕێی
دڵپاك و یاری ڕاستگۆدا بگەڕێت."
*"شێخ بەهایی"*

## من و تۆ

ڕۆژگارێك دوو هاوڕێ بوون کە زەمەنێك لەسەفەر و شاردا بەیەکەوە بوون. دواتر بارودۆخێکی وا هاتە پێش کە دەبوایە لەدەریادا سەفەر بکەن.

کاتێك کەشتییەکەیان گەیشتە ناوەڕاستی دەریا، یەکیان لەسەر سەکۆی کەشتیەکەوە کەوتە ناو ئاوی دەریا و نقوم بوو، هاوڕێکەی تری دوابەدوای ئەو خۆی فڕێ دایە ناو ئاوەکە و دواتر هەردووکیان ڕزگار کردن.

دوای سەعاتێك هەناسەیان هاتەوە بەر، یەکەم هاوڕێ بەوی تری وت: "ئەوا من کەوتمە ناو ئاوەکە، تۆ بۆچی خۆت بەئاودادا؟"

وتی: من بەبێ تۆ هەستم بەخۆم نەدەکرد، وامدەزانی کە تۆم."

# تەمەن ناكڕدرێتەوە!

پیاوێك كە بەپارەی حەرام دەوڵەمەند ببوو و سێ سەد هەزار دیناری كۆكردبۆوە، بڕیاری دا كە چیتر خۆی هیلاك نەكات و باقی تەمەنی بەشادی و خۆشی بباتە سەر. بەڵام هەر لەو كاتەدا ئیزرائیلْ پێی گەیشت تاكو ژیانی لێ بستێنێت. دنیا لەبەر چاوی ئەو پیاوە ڕەش و تاریك بوو. بەگریانەوە ڕووی كردە ئیزرائیلْ و پێی وت: "تەمەنێك زەحمەتم كێشاوە، ئێستا كە كاتی ئەوە هاتووە بەری ڕەنجی خۆم بخۆم، هاتووی بۆ ئەوەی ژیانم لێ بستێنیت؟ ئایا هەقە من ئێستا بمرم؟"

بەڵام ئیزرائیلْ هیچ گرنگییەكی بەقسەكانی ئەو نەدا و هەوڵیدا ژیانی بستێنێت. كابرا كە بینی ئیزرائیلْ سوورە لەسەر بڕیارەكەی، وتی: "كەوابوو سەد هەزار دینار لەمن وەربگرە و سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە. دوای سێ ڕۆژ وەرە و ژیانم بۆ تۆ!"

ئیزرائیلْ قبووڵی نەكرد.

كابرا وتی: "دووسەد هەزار دینارت پێ دەدەم. دوو ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە!"

ئیزرائیلْ قبووڵی نەكرد.

كابرا وتی: "هەموو دارایی خۆم... سێ سەد هەزار دینار دەدەم بەتۆ. تەنها یەك ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە كە زیندوو بم." بێ سوود بوو، ئیزرائیل هیچ پێشنیارێكی لێ قبووڵ نەكرد، سەرەنجام ئەو پیاوە

وتی: "کەوابوو ئەوەندە مۆڵەتم پێ بدە کە بتوانم رستەیەک بنووسم و بۆ ئەوانەی دوای خۆمی جێ بهێڵم."

ئیزرائیل بە ئەندازەی نووسینی رستەیەک مۆڵەتی پێدا.

کابرا پێنووسی هەڵگرت و نووسی: "ئەی خەڵکینە.. من ویستم یەک رۆژ لەتەمەنم بە سێ سەد هەزار دینار بکڕمەوە، پێیان نەفرۆشتم. ئینجا ئێوە کەڵک لەتەمەنی خۆتان وەربگرن، چونکە تەمەن ماڵی کڕین و فرۆشتن نییە."

*"عەتار نەیشابوری، الهی نامە"*

ئیبراهیم ئەدهەم لەبیابانێک دەڕۆیشت

بەردێکی بینی کە لەسەری نووسرابوو:

هەڵیبگێڕەوە و بیخوێنەوە!

کە بەردەکەی هەڵگێڕایەوە، نووسرابوو:

تۆ کە ئەوەی دەیزانی کاری پێناکەیت

چۆن داوای شتێک دەکەیت کە نایزانی

* * *

پرسیاریان لەداناییەک کرد:

"برا باشترە یان برادەر؟"

وتی:

"برادەر برایەکە کە مرۆڤ بەدڵی خۆی هەڵیدەبژێرێت."

* * *

لەدانایەکیان پرسی:

"سەختترین کارەسات چییە؟"

وتی:

"کەریم موحتاجی لەئیم (ڕەزیل) بێت"

* * *

لەکۆڕی جوامێراندا،

سێ شت لەبەرچاو بگرە:

کورتکردنەوەی قسەکانت،

کەمکردنەوەی خواردنت،

دواخستنی ڕۆیشتنت.

* * *

بە ئەسکەندەری مەقدونی-یان وت:

"ئەم هەموو نیشتمانەت داگیر کردووە

هێشتا قەناعەت ناکەیت؟!"

وتی:

"قەناعەت سروشتی چوارپێیەکانە."

* * *

ڕۆژێك پیاوێك بە شێخ ئەبو سەعیدی وت:

"یا شێخ! فلآن موریدت

کەوتۆتە سەر فلآنەڕێ، مەست و بێ ئاگایە"

شێخ وتی:

"شوکر بۆ خودا کەوتۆتە سەر ڕێیەك و نەڕوات

لەپێ نەکەوتووە."

* * *

کاتێك یەعقوب و یوسف

یەکتریان بینی، یەعقوب وتی:

"کوڕم هەواڵی خۆتم پێ ڕابگەیەنە."

یوسف وتی:

"باوکە! لێم مەپرسە کە براکانم چییان

لەگەڵ مندا کرد، پرسیاری ئەوە دەکەیت کە

خوداوەند چی لەگەڵ مندا کرد؟"

لەئەسکەندەریان پرسی:

"لەپاشایەتی خۆتدا چیت بەدەست هێنا

کە پتر لەهەموو شت تۆی خۆشحاڵ کرد؟"

وتی:

"توانای ئەوەی کە هەر کەس چاکەی بۆ من هەبوو،

پاداشی زیاتر لەچاکەکەی پێ دەدەم."

## چەند وانەیەکی زێڕین

لەناو حەوزێکدا خەزێنەیەکیان دۆزییەوە کە هی سەردەمی شاپووری مەلیك بوو، لەناو خەزێنەکەدا لۆحەیەکی زێڕین هەبوو کە ئەم ئامۆژگارییانەی لەسەر نووسرابوو:

ئامۆژگاری یەکەم: هەر پیاوێك کە دەرسەکانی رۆژگار عاقڵی نەکات، هەر دانایەك پەروەردەی بکات رەنج بەخەسارە.

ئامۆژگاری دووەم: هەر پیاوێك کە عەقڵی بەسەر خوو و خوێنیدا زاڵ نەبێت، لەچوارپێ خراپترە.

ئامۆژگاری سێهەم: هەر پیاوێك کە کەڵکی بۆ میللەتەکەی نەبێت، بەزیندوو هەژمار ناکرێت و لەمردوو خراپترە.

ئامۆژگاری چوارەم: فاسق-ێك کە دڵنەرم بێت زۆر چاکترە لەقورئان خوێن و زاهدێك کە تەکەبوری هەبێت.

* دانایەك لەکەنار دەریا دەژیا و، پڵنگێك برینداری کردبوو و بەهیچ دەرمانێك چاك نەدەبۆوە، ماوەیەك بەو دەردەوە ئاڵاندی و زوو زوو شوکری خودای دەکرد و دەیووت:

"سوپاس بۆ خودا کە گیرۆدەی بەڵایەکم نەك گوناه."

"سەعدی"

* لەشەڕی نێوان دارا و ئەسکەندەردا

دارا نامەیەکی بۆ نارد:

دارا لەناو هەشتا هەزار پیاوی شەڕکەردایە، ویستی بەم قسەیە ئەسکەندەر بترسێنێت.

ئەسکەندەر لەوەڵامدا بۆی نووسی:

"قەساب ترسی لەمێگەلی زۆر نییە."

* پیاوێك چووە لای دانایەك، وتی:

"لەم ڕۆژگارەدا برایانی دینی خۆشەویست بوونە و

بەدەگمەن پەیدا دەبن."

داناکە پێی وت:

"ئەگەر بەدوای کەسێکدا دەگەڕێیت کە یارمەتی بدەیت

لای من کەسی وا زۆرن!"

*"تذکرة الاولیاء"*

هیچ کارەساتێك لەنەزانی گەورەتر نییە.
*"سهل تستری"*

## دانایی

دانایەك وتی: خەڵك بەسەر چوار گروپدا دابەش دەبن:
یەکیان ئەوەیە کە دانایە و دەزانێت دانایە، دانایی لەو کەسەوە فێر بن.
یەکێکی تر ئەوەیە کە دانایە و نازانێت دانایە، ئەو کەسە فەرامۆشکارە، بەبیری بهێننەوە.
یەکێکی تر ئەوەیە کە نەزانە و دەزانێت نەزانە، شتی فێر بکەن.
یەکێکی تر ئەوەیە کە نەزانە و نازانێت کە نەزانە، لەو کەسە دوور بکەونەوە.
*"ئیمام محمد غزالی"*

کاتی خوێندنی لەئەفلاتون-یان پرسی:
بۆچی زیاتر لەباوکت ڕێز لەمامۆستاکەت دەگری؟
وتی: "لەبەر ئەوەی کە باوکم منی لەئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی، بەڵام مامۆستاکەم بەهۆی فێرکردنی زانست لەزەوییەوە منی گەیاندەوە بۆ ئاسمان."

بە فەیلەسوفێکیان وت:

"لەزانستەکاندا بەکوێ گەیشتووی؟"

وتی:

"گەیشتوومەتە ئاستێك کە دەزانم هیچ نازانم."

دەگێڕنەوە لەسوقڕات کە لەرۆژگاری پیریدا فێری مۆسیقا دەبوو، پێیان وت کە ئەی شێخی گەورە، تۆ شەرم ناتگرێت کە لەم تەمەنەدا بوویتەوە بە قوتابی؟

وتی: "زۆر شەرم دەکەم لەوەی کە لەتەمەنی پیریدا نەزان بم."

* * *

پرسیاریان لەمحەممەد غەزالی کرد:

"چۆن بەم ئاستە لەزانست گەیشتی؟"

وتی:

"هەرچییەکم نەزانیبا بێ ئەوەی شەرم بکەم پرسیارم دەکرد!"

*"گولستانی سەعدی"*

ئەفلاتون دەڵێت:

"سەیری ناو ئاوێنە بکە،

ئەگەر روخسارێکی جوانت هەیە

با کردەوەکانت شایەنی جوانییەکەت بێت و

ئەگەر ناحەز و ناڵەباریت،

بەکردەوەی خراپ خۆت ناحەزتر و ناڵەبارتر مەکە."

* * *

لەدانایەکیان پرسی:

"نیعمەتێك کە ئیرەیی بەخاوەنەکەی نەبەن

یان بەڵایەك کە تووشی هەر کەسێك بوو دڵسۆزی بۆ نەکەن، چییە؟"

وتی:

"ئەو نیعمەتە، دڵنزمییە و

ئەو بەڵایەش، تەکەبورە."

## بەدوای سێ شتدا مەگەڕێن کە نایدۆزنەوە

فضیل عیاض وتی:

"بەدوای سێ شتدا مەگەڕێن کە نایدۆزنەوە

بەدوای زانایەکدا مەگەڕێن کە زانستەکەی ڕادەی کردەوەکانی بێت

نایدۆزنەوە و بێ زانا بمێننەوە.

بەدوای کەسێکدا مەگەڕێن کە بێ خەوشی تێکەڵ بە کردەوەکانی بێت

نایدۆزنەوە و بێ کردەوە بمێننەوە و،

بەدوای برای بێ عەیبدا مەگەڕێن

کە نایدۆزنەوە و بێ برا بمێننەوە."

*عەتار نەیشابوری*

## گەڕان بەدوای ئاگردا

دەروێشێك بەخزمەتکارەکەی خۆی وت:

"ئاگری سوورم بۆ بهێنە لەدۆزەخەوە

تاکو نێرگەلەکەم بگەشێنمەوە.

خزمەتکارەکەی ڕۆیشت و دوای چەند خولەکێك گەڕایەوە

وتی: "ئەی دەروێش، لەدۆزەخ ئاگرم دەست نەکەوت. بەڵام بەباشی سەیرم کرد و بینیم، هەر

کەسەو لەئاگری کردەکانی خۆیدا دەسووتا!"

## دەبێت بەزێڕ بنووسرێت

## "وتار و قسەکانی حسن بصری"

* ئەرکی دراوسێیەتی تەنها ئەوە نییە کە ئازارت بۆیان نەبێت،
بەڵکو تەحەمول کردنی ئازارەکانیانە.

* لەنێوان دوو کردەوەدا چەندە جیاوازی هەیە،
کە یەکیان چێژەکەی سنووردارە و ئێشەکەی دەمێنێتەوە.
ئەوی تریان ئێشەکەی دەڕوات و پاداشەکەی دەمێنێتەوە.

* هەرکات شتێکی خراپت بە
منداڵەکەی خۆتەوە بینی،
بزانە کە ئەو خراپەیە هی تۆیە، کەوابوو خۆت چاك بکە.

* ئەگەر دەتهەوێت دنیا ببینیت کە لەدوای تۆ چی بەسەر دێت،
سەیر بکە
بزانە لەدوای مەرگی کەسانی تر چی بەسەر دێت.

* یەکێك وتی: لای حسن بصری بووین
کوڕەکەی هات و وتی:

"باوكە تیزگی سەقفی ماڵەكەمان شكاوە"

حەسەن سەیرێكی كرد و وتی:

"مەرگ لەوەش خێراتر دێت."

* كەریم ئەو كەسەیە كە بەڵێن دەدات و جێبەجێی دەكات

و پەلەی تێدا دەكات

و پیاوی سوكیش كە بەڵێن دەدات،

هەر ئەمڕۆ و بەیانی دەكات و درەنگ جێبەجێی دەكات.

* ناكۆكی ناخ و رواڵەت و

دڵ و زمان هەمان دووڕوویە.



## سەختترین شتەکان چین؟

لەکۆڕێکی کیسرا سێ کەس لەدانایان لێك خڕبوونەوە. فەیلەسوفی ڕۆم و حەکیمی هیند و بوزورگمێهر.

قسە لەسەر ئەوە کرا کە سەختترین شتەکان چین؟

ڕۆمی وتی:

"پیری و سستی لەگەڵ نەداری و هەژاری."

هیندییەکە وتی: "لەشی نەخۆش لەگەڵ خەمی زۆر."

بوزورگمێهر وتی: "نزیکبوونەوەی ئەجەل لەکاتی دوورکەوتنەوە لەچاکە و کاری باش."

هەمووان بەوتارەکەی بوزورگمێهر رازی بوون و لەقسەی خۆیان پاشگەز بوونەوە.

*"عەبدولرەحمان جامی"*

## سەرەتا بیرکردنەوە دوایی قسەکردن

کاتی خۆی پۆلێك داناى هيندی باسی بوزورگمیهریان دەکرد، لەکۆتاییدا جگە لەوەی کە لەقسەکردندا زۆر بەدرەنگی دەکەوێت و دەبێت زۆر چاوەڕێی بکەن تاکو وتەیەکی لێ دەبیستن، هیچ عەیبێکی تریان نێ نەدۆزییەوە.

بوزورگمیهر گوێی لەم قسانە بوو و وتی:

"بیرکردنەوە لەوە باشترە پەشیمان ببمەوە کە چیم وت".

## تەمەنت چەند ساڵە؟

لەبایەزیدیان پرسی:

"تەمەنی تۆ چەند ساڵە؟"

وتی: "چوار ساڵ"

وتیان: "چۆن شتی وادەبێت؟"

وتی:

"حەفتا ساڵە کە لەژێر حیجابی دنیادام.

بەڵام چوار ساڵە کە چاوم بەدنیادا کراوەتەوە و،

ڕۆژگاری ژێر حیجاب هەژمار ناکەم."

*"هەجویری، کشف المهجوب"*

## ماڵ و چێشتخانە

وەزیرێك كۆشكێكی تایبەتی دروست كرد و
پاشای بانگهێشت كرد.
پاشا بەناو كۆشكەكەیدا دەگەڕا،
گەیشتە چێشتخانەیەكی زۆر بچوك.
وتی ئەو چێشتخانەیە لەگەڵ فراوانی كۆشك ناگونجێت و،
وەزیری وتی:
"تەسكی چێشتخانەكە بووەتە مایەی فراوانی كۆشك."

* * *

هەرشتێك كە لەڕووی رەغبەت و ئیشتیاوە بیخۆیت، كەوابوو تۆ ئەمرت خواردووە و، ئەوەی بەنابەدڵی بیخۆیت كەوابوو ئەو تۆی خواردووە.

خواردن بۆ ژیان کردن و زیکر کردنە
وامەزانە کە ژیانکردن بۆ خواردنە
"سەعدی"

*ڕووناکی بەرین بۆ شوێنێک، کە تاریکی تێیدا زاڵە.*
*ئومێد بەرین بۆ شوێنێک، کە نائومێدی باڵی بەسەردا کێشاوە و،*
*لەڕووناکی ئاسماندا هەنگاو بنێین.*

سەرچاوەی عەشقی ئێمە بۆ
منداڵەکانمان گەورەترین ئارەزووی
رۆحە بۆ نەمری.
"ئەفلاتون"

## پرسیارکردن لەسوقرات

لەسوقراتیان پرسی:
"کام خەسڵەتی خەڵکی رۆژگاری خۆت
لۆمە دەکەیت؟"
وتی:
"هیمەتی من بۆ خواردن
بۆ ئەوەیە کە زیندوو بمێنم و
هیمەتی ئەوان بۆ ژیان لەبەر ئەوەیە
کە بخۆن!"

## ناوبانگی باش

دانایان وتوویانە:
"وەها بژی کە لەپشت سەرتەوە
باسی چاکەت بکەن
کە مەدحی رووبەڕوو لەرووی ترس یان ئومێدەوەیە.
لەژیاندا هەوڵ بدە لەکەسانی تر باشتر بی
کە لەدوای مەرگ هەمووان یەکسانن و
جگە لەناوبانگی باش، یان ناوبانگی خراپ
هیچی تر نامێنێتەوە.

پیاوێک بە فەیلەسوفێکی وت:
"فلانە کەس، دوێنی شەو ئاوەها باسی خراپەی تۆ دەکرد."
فەیلەسوف وەڵامی دایەوە:
"ئەوەی راستییەی کە ئەو شەرمی دەکرد
بەرامبەر بەخۆم بیڵێت،
تۆ رووبەڕوو بە منت وت."

* * *

لای شێخێك گلەییم کرد کە:
"فلان کەس شایەتی ناڕەوای لەسەر من داوە.
وتی:
بەچاکەی خۆت شەرمەزاری بکە."

## وەڵامی پێغەمبەر( ص )

دەگێڕنەوە: عەباس-ی مامی پێغەمبەر( ص ) داوای لێکرد
کە من بکە بە فەرمانڕەوای قەومێك.
وتی:
یا عم بك نفسك.
واتە: تۆم کرد بە میری نەفسی خۆت.
مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە کە
تۆ کە ناتوانی بەسەر نەفسی خۆتدا زاڵ بیت
چۆن دەتوانی حکومەت و
فەرمانڕەوای بەسەر خەڵکدا بکەیت؟

*"مجویری، کشف المحجوب"*

## لەناو خەڵکدا بە..

عەرەبێکیان بردە خزمەتی خەلیفە. بینی خەلیفە لەسەر تەخت دانیشتووە و ئەوانی تر لەخوارەوەی وەستاون.

وتی:

"السلام علیك یا الله."

وتی: "من الله نیم."

وتی: "... یا جبرائیل"

وتی: "جبرائیل نیم."

وتی: "الله نیت، جبرائیل نیت؟

کەرابوو بۆچی چوویتە ئەو سەرە و بە تەنیا دانیشتووی؟

تۆش وەرە خوارەوە و لەناو خەڵك دابنیشە."

*"عوبەید زاکانی"*

## کۆتایی حکومەتەکان

لەکتێبی ئەدەبی عەرەب-دا هاتووە کە پاش رووخانی ساسانییەکان، بوزورگمێهر ڕۆیشت بەرەو تەبەرستان.

پرسیاریان لێکرد کە هۆکاری کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی ساسانییەکان چی بوو. لەوەڵامدا وتی:

"لەبەر ئەوەی کاری گەورەیان بەخەڵکی بچوک ئەسپارد و کاری بچوکیشیان دایە خەڵکی گەورە، گەورەکان بەکارە بچوکەکان رازی نەبوون و بچوکەکانیش دەرەقەتی کارە گەورەکان نەهاتن و سەرەنجام هەموو هەوڵەکان تووشی شکست بوون.

"محەمەد تەقی بەهار"

# زوڵم

ڕۆژێک کیسرا دانیشتبوو، سەرپەرشتیاری چێشتخانە خواردنی هێنا و لەپێش کیسرا دایناـ لەپڕ پێی لەگۆشەیەکی تەختەکەی کیسرا هەڵچەقا و هەندێک لەخواردنەکە بەسەر کیسرادا ڕژا.

کیسرا تووڕە بوو و فەرمانی کرد کە سەرپەرشتیاری چێشتخانە سزا بدەن، ئەویش کاتێک ئەو فەرمانەی کیسرای بیست قاپی چێشتەکەی هەڵگرت و هەموو بەسەر کیسرادا ڕشت. کیسرا وتی: "مانای ئەمە چیبوو؟"

وتی: "ئەگەر بەتاوانی ئەوەی کە ڕوویدا منت سزا بدابوایە، زمانی خەڵك درێژ دەبوو و دەیانووت خزمەتکارێکی بێ تاوانی کوشت و زوڵمی کرد، من پێم باش نەبوو کە تۆ تووشی ئەو زوڵمە بکەم، بۆیە بە ئەنقەست قاپە چێشتەکەم بەسەرتدا ڕشت تاکو ئەگەر منت سزا دا، بەهۆی تاوانێکی گەورە بوایە نەك بەتاوانی سەهوێکی بچوك.

"محەمەد عوف"

## ئازادی رادەربڕین

ڕۆژێك حەجاج یوسف لەگەڵ پۆلێك لەهاوڕێکانی بەناو دەشتێکدا دەگەڕا.

لەدوورەوە شوانێکی بینی کە مەڕەکانی هێنابوو بۆ لەوەڕ. بەهاوڕێکانی وت:

لەشوێنی خۆتان بن، بۆلای ئەو شوانە دەچم و دەگەڕێمەوە. سواری ئەسپەکەی بوو و چووە لای شوانەکە و سڵاوی لێکرد. شوانەکە وەڵامی دایەوە.

حەجاج لێی پرسی: "کاکی شوان، حەجاج یوسف چۆن حاکمێکە؟"

وتی: "لەعنەتی خودای لێبێت کە هەرگیز زاڵمی وەکو ئەو حکومەتی نەکردووە، بێ بەزەیی و خوێنمژ، لەخوا ناترسێت و هیوادارم چی زووە لەسەر زەوی نەمێنێت!؟

حەجاج وتی: "من دەناسی؟" وتی: "نا" وتی: "من خودی حەجاجم!"

شوانەکە ترسا و ڕەنگی گۆڕا. حەجاج وتی: "ناوت چییە؟"

وتی: "ناوی من وەردان-ە و لەمانگدا سێ ڕۆژ تووشی صرع دەبم و شێت دەبم، ئەمڕۆ یەکێکە لەو ڕۆژانە!" حەجاج پێکەنی و پاداشتێکی دایە و ڕۆیشت.

"علی صفی"

## ئامۆژگاری

یەکێک لەداناکان چووە خزمەتی خەلیفە.

خەلیفە پێی وت:

"پیاوی عاقڵ! ئامۆژگارییەکم بکە!"

داناکە وتی:

"سەفەرێکم کرد بۆ چین. گوێی پاشای چین کەڕ ببوو.

دەگریا و دەیووت:

بۆ ئەوە ناگریم کە چیتر نابیسم،

بۆ ئەوە دەگریم کە نەکا ستەملێکراوێک لەدەرگام بدات و هاوار بکات، من نەیبیسم!"

*"نصیحه‌الملوک"*

## ئاسایشی کۆمەڵایەتی

ڕۆژێک کەریم خانی زەند چووە دیوانی داد. کەسێک هاواری لێ هەستا و وتی: "کوا ویژدان؟".

کەریم خان لێی پرسی: "تۆ کێیت؟"

وتی: "من بازرگانم و ئەوەی هەمبوو لێم دزرا."

کەریم خان وتی: "کاتێک سەروماڵی تۆیان دزی تۆ چیت دەکرد؟"

بازرگان وتی: "خەوتبووم."

کەریم خان وتی: "بۆچی خەوتبووی؟"

بازرگان وتی: "وامدەزانی تۆ بێداری!"



# عەلی (ع) و خەڵکی ئەنبار

عەلی(ع) کاتێك بەرەو کوفە دەهات، چووە ناو شاری ئەنبار، کە خەڵکەکەی ئێرانی بوون.

کوێخا و جووتیارە ئێرانییەکان خۆشحاڵ بوون کەوا خەلیفە خۆشەویستەکەیان بەناو شارەکەیاندا تێدەپەڕێت، بەرەوپیری چوون. کاتێك کاروانەکەی عەلی کەوتە ڕێ ئەوان لەپێش کاروانەکەی ڕایاندەکرد.

عەلی بانگی کردن و پرسی: "بۆچی رادەکەن، ئەمە چ کارێکە ئێوە دەیکەن؟!"

- "ئەمە جۆرێکە لەڕێزگرتن کە ئێمە بۆ میر و کەسانی پایەبەرز ئەنجامی دەدەین. ئەمە نەریتە و جۆرێکە لەئەدەب، کە لەناو ئێمەدا هەر باو بووە."
- "ئەم کارەی ئێوە لەم دونیایە تووشی ڕەنج و مەینەتیتان دەکات و لەدواڕۆژیش تووشی عەزاب دەبن. هەمیشە خۆتان لەم چەشنە کارانە بپارێزن کە سوك و ریسواتان دەکات."

*"داستانی راستان"*

## ڕێبوار

دەڵێن "ئیبراهیم" فەرمانڕەوای بەلخ هەموو ناز و نیعمەتێکی دنیای لەبەردەستدا بوو. ئەو خاوەنی هەموو چێژ و خۆشی و دارایی و هێزێک بوو، بەڵام دڵخۆش نەبوو و هەمیشە لەناخەوە هەستی بە بەتاڵی دەکرد. ڕۆحی بەدوای شتێکدا دەگەڕا کە خۆیشی نەیدەزانی چییە. ڕۆژێک بێگانەیەک هاتە ناو دەرباری فەرمانڕەوا. لەگەڵ ئەوەی گەیشتە ناو هۆڵی دەربار ڕاخەرێکی لەسەر زەوی ڕاخست و لەسەری خەوت. فەرمانڕەوا ئەو ڕەفتارەی بە سووکایەتی لەقەڵەم دا و پێی وت: "تۆ پێت وایە کە کۆشکی من چۆن جێگایەکە؟"

ئەو بێگانەیە بە فەرمانڕەوای وت: "بەڕای من کۆشکی ئێوە میوانخانەیە."

فەرمانڕەوا پرسی: "مەبەستت چییە کە کۆشکی من بە میوانخانە ناو دەنێیت؟"

وتی: "تکایە لەمن توڕە مەبن، بەڵام وەڵامی پرسیارەکەم بدەنەوە. بڵێن بەرلە ئێوە کێ لەم کۆشکەدا ژیانی بەسەر دەبرد؟"

فەرمانڕەوا وتی: "بەرلەمن باوکم لێرە دەژیا."

وتی: "ئێستا باوکی جەنابت لەکوێیە؟"

فەرمانڕەوا وتی: "ئەو مردووە."

پرسی: "پێش باوکت کێ لەم کۆشکەدا دەژیا؟"

فەرمانڕەوا وتی: "باپیرەم"

پرسی: "باپیرەت ئێستا لەکوێیە؟"

فەرمانڕەوا وتی: " ئەویش مردووە."

پرسی: "پێش باپیرەت کێ لەم کۆشکەدا دەژیا؟"

فەرمانڕەوا وتی: "بەرلەویش باوکی ئەو لێرە ژیاوە".

پرسی: "ئەو ئێستا لەکوێیە؟"

فەرمانڕەوا وتی: "ئەو مردووە."

کابرای بێگانە وتی: "کەوابوو بێگومان ئەم کۆشکە میوانخانەیە، چونکە خەڵکی دێن، ماوەیەك تێیدا دەمێننەوە و دواتر دەڕۆن، گەورەم.. ئێوەش دەبێت ڕۆژێك تەرکی ئێرە بکەن". ئەو بێگانەیە لەگەڵ وتنی ئەم قسانەی لەپڕ ون بوو، بەڵام وتەکانی کاری کردە سەر دڵی فەرمانڕەوا، ئەو بەخۆی وت: "ئێرە کۆشك نییە، بەڵکو میوانخانەیە".

گشت جیهان میوانخانەیە. زۆرکەس ڕۆژانە دێنە دنیاوە و زۆرکەسیش ڕۆژانەماڵئاوایی لەدنیا دەکەن. ئەم زەوییە ماڵی ئێمە نییە، کەوابوو ماڵی ڕاستەقینەی ئێمە لەکوێیە؟ لەکوێوە و بۆ چ مەبەستێك هاتووینەتە سەر ئەم هەسارەیە؟

* * *

you are greater than that  you are thinkin of 6



دەبێت بە زێڕ بنووسرێت

وتار و قسەکانی زەنوتی میسری

زەنوني ميسري دەڵێت: يەكێكم بینی کە بە ئاسماندا دەفڕی. وتم: چۆن گەیشتیتە ئەم ئاستە؟
وتي: پێم لەنەفس نا تاکو باڵم گرت.

- هاوڕێیەتی کەسێك بکە کە لەگەڵ گۆڕانی تۆدا نەگۆڕێت.
- هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە ڕواڵەتی گوزارشت لەناوەڕۆکی نەکات.
- وتیان دنیا چییە؟ وتی: ئەوەي تۆ سەرقاڵ بکات و لەحەق دوورت بخاتەوە.
- ڕەمزي خۆشبەختي من لەسێ شتدایە: چەندەی تەمەنم دەچێتە سەر، تەماحم کەمتر دەبێتەوە و، چەندەی ماڵ و موڵکم زیاد دەبێت، دەست و دڵ کراوەتر دەبم و، چەندەي پلە و پایەم بەرز دەبێتەوە، دڵنزمتر دەبم.
- شەرم لەخوا بکە کە ئەوەی پێت خۆش بێت داواي لێ دەکەیت، لەکاتێکدا ئەوەي خوا بەناپەسندی دەزانێت تۆ ئەنجامي دەدەیت.
- یەکەم ڕێگە بۆ گەیشتن بەخوا، خۆشەویستی و تەندروستییە.




چاپخانەی ڕۆژهەلات / هەولێر


 https://www.facebook.com/XanaySaya

 nawandy.saya@yahoo.com

نرخ ( 4000 ) دینار